# چۆن منداڵەکانمان فێری ئیمان و ئیسلام بکەین؟





نووسینی: یزن الغانم

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:
محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

# ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب: چۆن منداڵەکانمان فێری ئیمان و ئیسلام بکەین؟

نووسین: یزن الغانم

وەرگێڕان لە عەرەبییەوە: محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

پیتچنین: وەرگێڕ

پێداچوونەوە: هونەر مەولود حەسەن

نەخشەسازی بەرگ: مونەوەر گەیلان

نەخشەسازی ناوەڕۆك: مهدی تەیب مزویری

تیراژ: ٨٠٠٠ دانە

چاپخانە: تاران

ساڵ: ٢٠٢١

نۆبەتی چاپ: یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردن( ١٠١٠ )ی ساڵی (٢٠٢١)ی پێدراوە

## ناوەڕۆك


- **دەستپێك** ........................ ١١
- **سوپاس و پێزانین** ........................ ١٢
- **بەشی بیروباوەڕ (العقیدة)** ........................ ١٣

پ١:  خوایەکەت کێیە؟

پ٢: چ دینێکت هەیە؟

پ٣: پێغەمبەرەکەت کێیە؟

پ٤: باسی وشەی یەکخواپەرستی (التوحید) بکە و چ واتایەك دەبەخشێت؟

پ٥: خوا لە کوێیە؟

پ٦: شایەتمان هێنان بەوە کە محەمەد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە، چ واتایەك دەبەخشێت؟

پ٧: خوا بۆچی ئێمەی دروستکردووە؟

پ٨: گەورەترین ئەرکی سەرشانمان چییە؟

پ٩: جۆرەکانی یەکخواپەرستی چین؟

پ١٠: گەورەترین تاوان کامەیە؟

پ١١: باسی  هاوبەش دانان (شیرك) و جۆرەکانی بکە؟

پ١٢: ئایا جگە لە خوا، کەس پەنهان (غەیب) دەزانێت؟

پ١٣:پایەکانی باوەڕ (ایمان) بژمێرە؟

پ١٤: پایەکانی باوەڕ (ایمان) ڕاڤە (شرح) بکە؟

پ١٥: پێناسەی قورئان بکە؟

پ١٦: سوننەت چییە؟
پ١٧:بیدعە چییە؟ ئایا بیدعە ڕێپێدراوە؟
پ١٨: باسی بیروباوەڕی (وەلاء و بەڕاء) بکە؟
پ١٩: هاوەڵ (سەحابە) کێن؟ ئایا خۆشم بوێن؟
پ٢٠:ماڵی باوەڕداران کامەیە؟
پ٢١: ماڵی بێباوەڕان کامەیە؟
پ٢٢: پێویستە باوەڕدار ترس و تکا (خەوف و رجاء)ی هەبێت، ترس و تکا چییە؟ هیچ بەڵگەیەك لەسەری هەیە؟
پ٢٣: باسی هەندێك لە ناو و سیفەتە بەرزەکانی خوا بکە؟
پ٢٤: ئەم ناوانە ڕاڤە بکە؟
پ٢٥: ئایا باوەڕ (ایمان) گوتن و کردارە؟
پ٢٦: ئایا باوەڕ کەم و زیاد دەبێت؟
پ٢٧: چاکە (احسان چییە؟)
پ٢٨: مەرجی قبووڵبوونی کار و کردەوەکان لای خوا چییە؟
پ٢٩: پشتبەستن (توکل) بەخوا چییە؟
پ٣٠: فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە چییە؟

- **بەشی فیقهـ** ........................................ ٢٨

پ١: پێناسەی خۆپاککردنەوە (الطهارة) چییە؟
پ٢: چۆن خۆت لە چڵکی و پیسی پاك دەکەیتەوە؟
پ٣: خێر و پاداشتی دەستنوێژ چییە؟
پ٤: چۆن دەستنوێژ هەڵدەگری؟

پ٥: مەرجەکانی دەستنوێژ چین؟

پ٦: سوننەتەکانی دەستنوێژ چین؟

پ٧: ئەو شتانەی دەستنوێژ بەتاڵ دەکەنەوە بژمێرە؟

پ٨: تەیەموم چییە؟

پ٩: تەیەموم چۆن دەکرێت؟

پ١٠: تەیەموم بەچی بەتاڵ دەبێتەوە؟

پ١١: نوێژ چییە؟

پ١٢: حوکمی نوێژ چییە؟

پ١٣: لە شەوو ڕۆژێکدا چەند نوێژ لەسەر موسڵمان واجبە؟

پ١٤: مەرجەکانی نوێژ بژمێرە؟

پ١٥: پایەکانی نوێژ بژمێرە؟

پ١٦: ئەرك و واجبەکانی نوێژ چین؟

پ١٧: سوننەتەکانی نوێژ چین؟

پ١٨: بەتاڵکەرەوەکانی نوێژ بژمێرە؟

پ١٩: موسڵمان چۆن نوێژ دەکات؟

پ٢٠ نوێژە سوننەتە ڕاتبەکان کامانەن؟

پ٢١: خشوع لە نوێژدا چییە؟

پ٢٢: پێناسەی زەکات بکە؟

پ٢٣: سەدەقەی سوننەت (المستحب) چییە؟

پ٢٤: پێناسەی ڕۆژوو بکە؟

پ٢٥: پێناسەی حەج و عومەرە بکە؟

پ١: ڕەچەڵەك (نەسەب)ی پێغەمبەرمان محەمەد(ﷺ) چییە؟

پ٢: ناوی دایکی پێغەمبەرمان(ﷺ) چییە؟

پ٣: باوکی پێغەمبەرمان(ﷺ) کەی وەفاتی کردووە؟

پ٤: پێغەمبەرمان (ﷺ) کەی لەدایك بووە؟

پ٥: پێغەمبەرمان (ﷺ) لە چ شارێك لەدایك بووە؟

پ٦: جگە لە دایکی، کێ شیری بە پێغەمبەر (ﷺ) داوە و دایانی بووە؟

پ٧: دایکی پێغەمبەرمان (ﷺ) کەی وەفاتی کردووە؟

پ٨: دوای مردنی عەبدولموتەلیب، کێ پێغەمبەری بەخێوکرد؟

پ٩: پێغەمبەرمان(ﷺ) کەی لەگەڵ مامی سەفەری کرد بۆ شام؟

پ١٠: دووەم سەفەری پێغەمبەر کەی بوو؟

پ١١: قوڕەیشییەکان کەی کەعبەیان بیناکردەوە؟

پ١٢: تەمەنی پێغەبەر (ﷺ) چەندبوو، کە کرا بە پێغەمبەر؟ هەروەها پێغەمبەر بۆ کێ ڕەوانەکراوە؟

پ١٣: دەستپێکی نیگا (وەحی)، بەچی دەستی پێکرد؟

پ١٤: دۆخی پێغەمبەرمان(ﷺ)، پێش دابەزینی وەحی چۆن بوو؟ هەروەها یەکەمجار کە (وەحی)ی بۆ دابەزی کەی بوو؟

پ١٥: یەکەم سورەتی قورئان کە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی کامەبوو؟

پ١٦: کێ یەکەم کەس بوو، کە باوەڕی بە پێغەمبەر (ﷺ) هێنا؟

پ١٧: سەرەتای دابەزینی وەحی، بانگکردنی خەڵك بۆ ئیسلام چۆن بوو؟

پ١٨: دۆخی پێغەمبەر (ﷺ) و باوەڕداران چۆن بوو، دوای ئەوەی بەئاشکرا خەڵك بانگکرا بۆ هاتنە ناو ئیسلام؟

پ١٩: کێ لە ساڵی دەیەمی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەردا وەفاتی کرد؟
پ٢٠: ئیسرا و میعراج کەی بوو؟
پ٢١: پێغەمبەر (ﷺ)چۆن خەڵکی دەرەوەی مەککەی بانگهێشت دەکرد بۆ هاتنە ناو ئیسلام؟
پ٢٢: پێغەمبەر (ﷺ)چەند ساڵ لە مەککە مایەوە؟
پ٢٣: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کوێ کۆچی کرد؟
پ٢٤: پێغەمبەر (ﷺ)چەند ساڵ لە مەدینە مایەوە؟
پ٢٥: لە شاری مەدینە چی لەسەر پێغەمبەر (ﷺ) فەرزکرا؟
پ٢٦: گرنگترین غەزایەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کامانەن؟
پ٢٧:کۆتا ئایەتی قورئانی پیرۆز کە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی کامەبوو؟
پ٢٨: پێغەمبەر (ﷺ) کەی کۆچی دوایی کرد و تەمەنی چەندبوو کە کۆچی دوایی کرد؟
پ٢٩: ناوی هەندێك لە هاوسەرانی پێغەمبەر (ﷺ) بژمێرە؟
پ٣٠: ناوی منداڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بنووسە؟
پ٣١: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر چی ئوممەتەکەی جێهێشت؟

• **بەشی ڕاڤە (تەفسیر)** ........................................ ٥٢

پ١: سورەتی (الفاتحة)بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟
پ٢: سورەتی (الاخلاص)بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟
پ٣: سورەتی (الفلق)بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟
پ٤: سورەتی (الناس)بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟
پ٥: سورەتی (العصر)بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟
پ٦: سورەتی (الزلزلة)بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟

پ١: فەرموودەی (إنما الأعمال بالنيات) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ٢: فەرموودەی (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه، فهو ردٌّ) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ٣: فەرموودەی جبرائیل بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ٤: ئەو فەرموودەیە بخوێنەرەوە، كە باس لە فەزلی ڕەوشتبەرزی (حسن الخلق) دەكات، هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ٥: فەرموودەی (من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ٦: فەرموودەی (لا يُؤْمِنُ أحدُكم حتى أكونَ أحبَّ إليه) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ٧: فەرموودەی (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ٨: ئەو فەرموودەیە بخوێنەرەوە، كە باس لە فەزلی سورەتی (الاخلاص) دەكات، هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ٩: ئەو فەرموودەیە بخوێنەرەوە، كە باس لە فەزلی (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِالله) دەكات، هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ١٠: فەرموودەی (أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

پ١١: فەرموودەی (من كان آخر كلامه من الدنيا لا إله إلا الله) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟
پ١٢: فەرموودەی كوڕی مەسعوود لەبارەی (زمانپارێزی) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەكانیشی باس بكە؟

• بەشی ئادابە ئیسلامییەكان ........................................................ ٦٧

پ١: ئەدەب لەگەڵ خودا دەبێ چۆن بێت؟
پ٢: ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ) دەبێ چۆن بێت؟
پ٣: ئەدەب لەگەڵ دایك و باوك دەبێ چۆن بێت؟
پ٤: چۆن سیلەی ڕەحم جێبەجێ بكەم؟
پ٥:چۆن هەڵسوكەوت لەگەڵ برا و هاوڕێكانم بكەم؟
پ٦:ئادابەكانی هاوسێیەتی چین؟
پ٧: ئادابەكانی میوانداری چین؟
پ٨: باسی ئادابەكانی نەخۆشی و نەخۆش بكە؟
پ٩: باسی ئادابەكانی زانستخوازی بكە؟
پ١٠: ئادابەكانی كۆڕ و مەجلیسەكان چین؟
پ١١: باسی ئادابەكانی نووستن بكە؟
پ١٢: ئادابەكانی نانخواردن چین؟
پ١٣: ئادابەكانی جلپۆشین چین؟
پ١٤: باسی ئادابەكانی سواربوون بكە؟
پ١٥: باسی ئادابەكانی ڕێگا بكە؟
پ١٦: باسی ئادابەكانی چوونەماڵەوە و دەرچوون لە ماڵەوە بكە؟

پ١٧: باسی ئادابەکانی چوونە ئاودەست بکە؟

پ١٨: باسی ئادابەکانی مزگەوت بکە؟

پ١٩: باسی ئادابەکانی سەلامکردن بکە؟

پ٢٠: باسی ئادابەکانی مۆڵەتوەرگرتن بکە؟

پ٢١: باسی ئادابەکانی سەرەدەرکردن لەگەڵ ئاژەڵ بکە؟

پ٢٢: باسی ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بکە؟

# دەستپێك

بەناوی خوای مەزن و دلۆڤان

هەڵبەت ئەم کتێبەی کە ئێستا لەبەردەستی ئێوەی هێژادایە، ناوونیشانی دەقە عەرەبییەکەی ئەمەیە: "ما لا يسع أطفال المسلمين جهله"، کە لەلایەن ماموستای بەڕێز (يزن الغانم)ەوە نووسراوە و بڵاوکراوەتەوە، بەڵام کە دەستمان بە وەرگێڕانی کتێبەکە کرد، هەستمان کرد ناوونیشانی کتێبەکە بە کوردی تۆزێك درێژ دەبێتەوە و لەسەر زاری منداڵان قورس دەبێت، بۆیە ناچار بووین ناوەکەی بگۆڕین و ناوێکی دیکە بۆ کتێبەکە هەڵبژێرین، بەم ناوونیشانە "چۆن منداڵەکانمان فێری ئیمان و ئیسلام بکەین؟"، کە هەمان واتا و ڕامان دەبەخشێت.

لەڕاستیدا کتێبەکە وەك کەتەلۆکێك وایە بۆ منداڵە موسڵمانەکان، واتە منداڵەکانمان لە ڕێگەی ئەم کتێبەوە بە خوا و پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانییەکان و پایەکانی ئیمان و ئادابە گشتییەکانی ئیسلام ئاشنا دەبن و لێی سوودمەند و بەهرەمەند دەبن.

بۆیە لە سۆنگەی هەستکردنم بەبەرپرسیاریەتی، بەپێویستم زانی؛ کتێبەکە وەربگێڕمە سەر زمانی کوردی؛ بۆ ئەوەی منداڵەکانی ئێمەش لێی سوودمەندبن و بەشێوەیەکی باشتر و جوانتر بەدینی پیرۆزی ئیسلام ئاشنابن.

جا هیوادارم ئەم دیارییە بەنرخە بگاتە دەست هەموو منداڵانی کوردستان، بۆ ئەوەی زیاتر خوا و ئیمان و ئیسلامیان خۆش بوێت و لەسەر ئەو بناغەیە بێنە پەروەردە و فێرکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندن.

لە کۆتاییدا، لە خوای مەزن دەپاڕێمەوە کە لێمانی قبووڵ کردبێت و بیخاتە تای تەرازووی چاکەکانمانەوە.

وەرگێڕ

محەمەدساڵح پێندرۆیی (جگەرسۆز)

ساڵی ٢٠٢١

## سوپاس و پێزانین

زۆر سوپاسی مامۆستای هێژا (ئەحمەد تاهیر محەمەد) دەکەم، کە لەسەر ڕاسپاردەی جەنابیان کتێبەکەم وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی، هەروەها ئەرکی چاپکردنیشی گرتە ئەستۆی خۆی، خوا پاداشتی چاکەکەی بداتەوە و نموونەی زۆر بێت.



## بەشی بیروباوەڕ (العقیدة)

پ١: خوایەکەت کێیە؟

وەڵام: خوایەکەم (الله)یە، کە من و گشت جیهانیانی پێگەیاندووە بە نیعمەتەکانی،بەڵگەش لەسەر ئەمە، فەرموودەی خوایە ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ (الفاتحة ٢)

ڕامانەکەی بە کوردی[1]:" سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە."

پ٢: چ دینێکت هەیە؟

وەڵام: دینم ئیسلامە، واتە ملکەچبوون بۆ خوای تاکوتەنیا بە یەکخواپەرستی، هەروەها پابەندبوون پێیەوە بە عیبادەتکردنی خوا و خۆبەریکردن لە هاوبەش دانان و هاوبەش دانەران (شیرکپەرستان).

خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ﴾ (ال عمران ١٩)

ڕامانەکەی بە کوردی: بەڕاستی دین و ئایینی پەسەند لای خوا تەنیا ئایینی ئیسلامە.

پ٣: پێغەمبەرەکەت کێیە؟

وەڵام: پێغەمبەرەکەم محەمەدە (ﷺ)

---

([1]) ڕاڤە و تەفسیری گشت ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لە تەفسیری مامۆستا بورهان محەمەد ئەمین وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ (الفتح٢٩)
ڕامانەکەی بە کوردی:"محەمەد (ﷺ) ڕەوانەکراوی خوایە."
پ٤: باسی وشەی یەکتپارستی (التوحید) بکە و چ واتایەك دەبەخشێت؟
وەڵام: وشەی یەکخواپەرستی (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ)یە، واتایەکەیشی ئەوەیە، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا.
خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ (محمد١٩)
ڕامانەکەی بە کوردی: "ئەی ئینسان! دەی کەواتە چاک بزانە و دڵنیابە جگە لە خوا، هیچ خوایەکی تر نییە."

پ٥: خوا لە کوێیە؟
وەڵام: خوا لەسەر عەرەشە لە ئاسمان، بەرز و باڵاترە لەگشت دروستکراوەکانی.
خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ (طه ٥)
ڕامانەکەی بە کوردی:"خوای میهرەبان بەسەر تەختی فەمانڕەوایەتی خۆیەوە وەستاوە (عەرشی ئەو زاتە لە سەروو حەوت چین ئاسمانەوەیە و لەوێوە سەرپەرشتی هەموو بەدیهێنراوەکان دەکات."
هەروەها دەفەرموێت: وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ (الانعام ١٨)
ڕامانەکەی بە کوردی:"هەر ئەو خوایەش زاڵ و باڵادەستە بەسەر هەموو بەندەکانیدا و هەر ئەویشە زاتێکی دانا و ئاگایە (بەنهێنی و ئاشکرای بەندەکانی)."

پ٦: شایەتمان هێنان بەوە کە محەمەد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە چ واتایەك دەبەخشێت؟
وەڵام: واتە خوا، محەمەد پێغەمبەری وەك مژدەدەر و ترسێنەر ڕەوانە کردووە بۆ جیهانیان، بۆیە پێویستە:




١. فەرمانەکانی جێبەجێ بکرێن.
٢. باوەڕهێنان بەوەی کە خەبەری پێداوە.
٣. بێ فەرمانی نەکرێت.
٤. خوا نەپەرسترێت، بەو شەرعە نەبێ کە محەمەد پێغەمبەر هێناویەتی، ئەویش بریتییە لە پابەندبوون بە سوننەت و وازهێنان لە بیدعە.
٥. پێویستە پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو کەسێك خۆشەویستتر بێت.

خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرمویێت: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ﴾ (النساء٨٠)

ڕامانەکەی بە کوردی:" ئەوەی فەرمانبەرداری پێغەمبەر (ﷺ) بکات، ئەوە بەڕاستی فەرمانبەرداری خوای کردووە."

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ﴾ (النجم٣،٤)

ڕامانەکەی بە کوردی:" قسەو گوفتاریشی (ئەوەی کە قورئانە) لە ئارەزووبازی و هەواو هەوەسەوە نییە، ئەمەی کە ڕایدەگەیەنێت تەنیا نیگا و وەحی خواییە."

هەروەها دەفەرموێت: ﴿لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا﴾ (الاحزاب٢١)

ڕامانەکەی بە کوردی:" سوێند بەخوا بەڕاستی لە پێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو و ڕێکوپێکە تا چاوی لێبکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندیی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بە یادی ئەو."

پ٧: خوا بۆچی ئێمەی دروستکردووە؟

وەڵام: خوا بۆ ئەوە ئێمەی دروستکردووە، تا تەنیا عیبادەتی ئەو زاتە بکەین و هاوەڵ و شەریکی بۆ قەرار نەدەین، نە بەمەبەستی ڕابواردن نە بەیاری و گاڵتە و گەپیش.



خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ (الذاريات٥٦)

ڕامانەکەی بە کوردی:" بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە، تەنیا بۆ ئەوەنەبێت کە من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن."

پ٨: گەورەترین ئەرکی سەرشانمان چییە؟

وەڵام: گەورەترین ئەرکی سەرشانمان پەرستنی خوایە بەتاکوتەنیایی.

پ٩: جۆرەکانی یەکخواپەرستی چین؟

وەڵام:

١. یەکخواپەرستی پەروەردگاریەتی (التوحيد الربوبية): بریتییە لەوە کە پەروەردگار دروستکەر و ڕۆزیبەخشە و خاوەنی هەموو بوونەوەرە و کاروباری هەموان بەڕێوەدەبات.

٢. یەکخواپەرستی پەرستراویەتی (التوحيد الألوهية): بریتییە لە پەرستنی خوا بەتاکوتەنیایی، واتە هیچ کەسێك ناپەرسترێت جگە لە خوا.

٣. یەکخواپەرستی ناو و سیفەتەکان (التوحيد الاسماء و الصفات): بریتییە لە باوەڕهێنان بەو ناو و سیفەتە جوانانەی خوا، کە لە قورئانی پیرۆز و سوننەتدا هاتوون، بەبێ ئەوەی بە کەسێکی دیکە تەشبیه بکرێت و بچوێندرێت.

بەڵگە لەسەر ئەمە، فەرموودەی خوایە، کە دەفەرموێت:

رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ ۚ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا (مريم٦٥)

ڕامانەکەی بە کوردی:" ئەو زاتە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو دروستکراوانی نێوانیانە، کەواتە، هەر ئەو بپەرستە و زۆر بەردەوام و



خۆگربە لە پەرستنیدا، ئایا کەس شک دەبەیت هاوناوی ئەو و هاوتای ئەو بێت؟ خاوەنی سیفەتی بەرز و بڵند و پیرۆز بێت وەک ئەو؟!

پ١٠: گەورەترین تاوان کامەیە؟

وەڵام: گەورەترین تاوان هاوەڵ و هاوبەشدانانە بۆ خوا.

خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت:

**إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا** (النساء ٤٨)

ڕامانەکەی بە کوردی:" بەڕاستی خوا خۆش نابێت ئەگەر هاوەڵی بۆ بڕیار بدرێت، بێجگە لەوە لە هەر گوناهێکی تر بیەوێت خۆش دەبێت، بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت، جا ئەوەی هاوەڵ و شەریک بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە ئیتر بەڕاستی تاوانێکی گەورەی هەڵبەستووە."

پ١١: باسی هاوبەش دانان (شیرك) و جۆرەکانی بکە؟

وەڵام: هاوبەش دانان (شیرك)، بریتییە لە پەرستنی خوایەکی دیکە لەگەڵ خوای گەورە.

جۆرەکانی:

١. هاوبەش دانانی گەورە: وەك: دوعا و پاڕانەوە لە غەیری خوا، هەروەها کڕنۆش بردن بۆ غەیری خوا.

٢. هاوبەش دانانی بچووك: وەك: سوێندخواردن بەغەیری خوا، یاخود هەڵواسینی نۆشتە، بەمەبەستی سوودگەیاندن یان لابردنی زیان لەسەر کەسێك یان شتێك.

پ١٢ ئایا جگە لە خوا، کەس پەنهان (غەیب) دەزانێت؟

وەڵام: جگە لە خوا کەس غەیب نازانێت.

خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت:



قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ (النمل ٦٥)

ڕامانەکەی بە کوردی:" (ئەی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان بڵێ: جگە لە خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هیچیان ئاگادارنین لە پەنهان و شاراوەکان، هەستیش ناکەن کەی زیندوو دەکرێنەوە."

پ١٣: پایەکانی باوەڕ (ایمان) بژمێرە؟

وەڵام:

١. باوەڕهێنان بە خوا.
٢. باوەڕهێنان بە فریشتەکان.
٣. باوەڕهێنان بە کتێبە ئاسمانییەکان.
٤. باوەڕهێنان بە پێغەمبەرەکان.
٥. باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی.
٦. باوەڕهێنان بە قەزا و قەدەر(خێر و شەڕی).

بەڵگە: فەرموودەی بەناوبانگی حەزرەتی جوبرەئیلە لای موسڵم(٢)، کە فەرمووی بە پێغەمبەر (ﷺ)، خەبەرم بدەرێ لەبارەی باوەڕ (ایمان)، وتی: ئیمان ئەوەیە، باوەڕت هەبێت بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی و باوەڕیشت هەبێت بە قەدەر، خێرەکەی و شەڕەکەی.

(٢) قال جبريل للنبی (ﷺ) فَأَخْبِرْنِي عَنِ الْإِيمَانِ، قَالَ: «أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ، وَمَلَائِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الْآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ» رواه مسلم.



پ١٤: پایەکانی باوەڕ (ایمان) ڕاڤە (شرح)بکە؟

وەڵام:

١. باوەڕهێنان بە خوا: **باوەڕت وابێت کە خوا تۆی ئافراندووە و ڕزق و ڕۆزیی پێ بەخشیوی، ئەو خوایەی کاروباری گشت دروستکراوەکانی خۆی بەتەنیا بەڕێوە دەبات و هەر ئەو زاتە پەرستراوە و هیچ پەرستراوێکی دیکە نییە، خوایەکی مەزن و کاملە و هەموو سوپاس و ستایشێك هەر بۆ ئەوە، هیچ هاوەڵێکی نییە و لە کەس ناچێت و کەسیش لەو ناچێت.**

٢. باوەڕهێنان بە فریشتەکان: **فریشتەکان مەخلوقاتێکن، خوا لە ڕووناکی دروستی کردوون، بۆ ئەوەی فەرمانبەرداری خوا بکەن و لە ئەمر و فەرمانەکانی دەرنەچن.**

**لەوانەش حەزرەتی جوبرەئیلە علیه السلام()، کە هێنەری نیگا (وەحی)بووە لە ئاسمانەوە بۆ پێغەمبەرانی خوا.**

٣. باوەڕهێنان بە کتێبە ئاسمانییەکان: **ئەو کتێبانەن کە لە ئاسمانەوە دابەزێنراون بۆ سەر پێغەمبەران، وەك:**

- **قورئان بۆ محەمەد (ﷺ)**
- **ئینجیل بۆ عیسا (علیه السلام)**
- **تەورات بۆ مووسا (علیه السلام)**
- **زەبوور بۆ داود (علیه السلام)**
- **صوحوف بۆ ئیبراهیم و مووسا (علیهم السلام)**

٤. باوەڕهێنان بە پێغەمبەرەکان: **ئەو پێغەمبەرانەن، کە خوا ناردوونی بۆ بەندەکانی، تاکوو فێریان بکەن و مژدەی خێر و بەهەشتیان بدەنێ و لە شەڕ و ئاگری دۆزەخیش بیان ترسێنن.**

**باشترینی ئەو پێغەمبەرانەش (أولو العزم)ەکانن، کە ئەمانەن:**

- **نوح (علیه السلام)**
- **ئیبراهیم (علیه السلام)**

- موسا (عليه السلام)
- عیسا (عليه السلام)
- محەمەد (ﷺ)

٥. باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی: **بریتییە لە باوەڕهێنان بە قۆناغی پاش مردن و قەبر و ڕۆژی دوایی و هەق و حیساب، کە لەو ڕۆژەدا ئەهلی بەهەشت لە شوێنی خۆیان ئۆقرە دەگرن، ئەهلی ئاگریش دەچنە شوێنی خۆیان.**

٦. باوەڕهێنان بە قەزا و قەدر (خێر و شەڕەکەی): **بریتییە لە چوار پلە، کە ئەمانەن:**

**١. زانستی خوا، بریتییە لەوە کە خوا عیلمی بە هەموو شتێك هەیە و عیلمەکەی هەموو شتێکی گرتووەتەوە و داپۆشیوە، پێش قەومانی و دوای قەومانیشی، بەڵگەش لەسەر ئەمە، ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە، کە خوا دەفەرموێت:**

**إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْأَرْحَامِ ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌ مَّاذَا تَكْسِبُ غَدًا ۖ وَمَا تَدْرِى نَفْسٌۢ بِأَىِّ أَرْضٍ تَمُوتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌۢ (لقمان ٣٤)**

ڕامانەکەی بە کوردی:" **بەڕاستی هەر خوا خۆی زانیاری بەرپابوونی ڕۆژی قیامەت دەزانێت، بارانیش هەر ئەو دەیبارێنێت، دەزانێت چی لە سکی دایکاندا هەیە، هیچ کەس نازانێت سبەی چی بەسەردێت و چی دەست دەکەوێت (لەبەرهەمی ماددی دنیایی یان لە زەخیرە و توێشووی قیامەت)، هیچ کەسیش نازانێت لەسەر چ زەوییەک دەمرێت و کۆتایی بەژیانی دێت (هەروەها کاتی مردن و چۆنیەتییەکەیشی شاراوەیە) بەڕاستی خوا بە هەموو شتێک زانایە و ئاگادارە."**

**٢. خوا هەموو شتێکی لە لای خۆی لە لەوحی مەحفۆزدا نووسیوە، ئەوەی کە پێشتر قەوماوە و ئەوەیش کە دواتر دەقەوێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە، ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە، کە خوا دەفەرموێت: وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا**



يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعْلَمُ مَا فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ (الانعام ٥٩)

ڕامانەکەی بە کوردی:" کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنییەکان بەدەست خوایە و هەر لای ئەوە، کەس نایانزانێت جگە لەو زاتە هەرچی لەسەر وشکانییە (لە گیاندارو بێ گیان و گیاو دارو زیندەوەرانی وردو درشت لەسەر زەوی و لە توێی خاکدا) خوا پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە دەریاکانیشدا هەیە (لە زیندەوەری هەمەجۆرو ماسی سەیرو سەمەرە) ئاگای لێیەتی و هیچ گەڵایەک ناکەوێتە خوارەوە خوا پێی نەزانێت، هەروەها دەنکێک یان تۆوێک لە تاریکایەکانی زەویدا نییە، ئەو دەنکە چ شێدار بێت یان وشک بێت، هیچ شتێک نییە لە خوا پەنهان بێت و لە (لوح المحفوظ) دا، یاخود لە دۆسیە و دەزگای تایبەتیدا تۆمار نەکرابێت."

٣. هەموو شتێك بە حەز و ویستی خوا ڕوودەدات و هیچ شتێك لای ئەو یان لای بەندەکانی، بەبێ حەز و ویستی ئەو زاتە ڕوونادات، مەگەر ویستی ئەوی لەسەر بێت.

بەڵگەش لەسەر ئەمە، ئەم ئایەتانەی قورئانی پیرۆزە، کە خوا دەفەرموێت:
لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ
(التكوير ٢٨-٢٩)

ڕامانەکەی بە کوردی:" بۆ ئەوانەتان کە دەیانەوێت ڕێبازی ڕاست و دروست بگرنەبەر، ویستی ئێوەش نایەتە دی، مەگەر کاتێك خوای پەروەردگاری جیهانیان بیەوێت، (هەرکەس ویستی خێری هەبێت خوای گەورە سەربەرستی لێ زەوت ناکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەوە پێش دێت کە ویستی خوای لەسەرە و توانای تێگەیشتنمان لە نهێنی و شاراوەکان زۆر سنووردارە."



٤. باوەڕهێنان بەوە کە هەموو بوونەوەرێك،لەلایەن خواوە دروستکراوە، هەروەها هەر سیفەت و جووڵە و شتێکیان هەبێت، لەلایەن خواوە پێ بەخشراوە.
بەڵگەش لەسەر ئەمە، ئەم ئایەتەی قورئانی پیرۆزە، کە خوا دەفەرموێت:
**وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ (الصافات ٩٦)**
ڕامانەکەی بە کوردی:" لەکاتێکدا خوا بەدیهێنەری ئێوەیش و ئەم بتانەشە کە دروستتان کردوون (نەشیانتوانی بەرگری لە خۆیان بکەن!"

پ١٥: پێناسەی قورئان بکە؟
وەڵام: فەرموودەی خوایە و دروست نەکراوە، خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: **وَإِنْ أَحَدٌ مِّنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٱسْتَجَارَكَ فَأَجِرْهُ حَتَّىٰ يَسْمَعَ كَلَـٰمَ ٱللَّهِ** (التوبة ٦)
ڕامانەکەی بە کوردی:" ئەی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەی ئیماندار، خۆ ئەگەر کەسێک لە هاوەڵگەران داوای پەنای لێ کردیت، ئەوە تۆیش پەنای بدە هەتا گوێی لە فەرموودەکەی خوا (قورئان) دەبێت."

پ١٦: سوننەت چییە؟
وەڵام: هەموو گوتنێك، یان کردارێك یان ئیقرارێك، یاخود سیفەتێکی خودی یان ئاکاریی پێغەمبەر(ﷺ) دەگرێتەوە.
پ١٧: بیدعە چییە؟ ئایا بیدعە ڕێپێدراوە؟
وەڵام: هەر شتێکی نوێ و تازە دەگرێتەوە. کە لەلایەن خەڵکەوە خرابێتە ناو دینەوە و لەسەردەمی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی نەبووبێت.
ڕێپێدراویش نییە، پێغەمبەرمان (ﷺ) فەرموویەتی:"کل بدعة ضلالة."، واتە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە.





بـۆ نمـوونه: هەر زیادکراوێـك لە عیبادەتـدا، وەك زیـادکردن لە دەسـتنوێژهەڵگرتندا، وەك مەسـحکردنی گەردەن، ڕێپێـدراو نیـیە. دوو جـۆرە بیـدعە هەیە: جـۆری یەکەم: بیـدعەی بیـرو بـاوەڕ و گوفتار. جۆری دووەم: بیـدعە لە عیبادەتەکانـدا: ئەویـش پەرسـتنی پەروەردگارە بەعیبادەتێك کە خۆی بەشەرعی ڕێی پێ نەدابێت.(۳)

پ١٨: باسی بیروباوەڕی وەلاء و بەڕاء بکە؟

وەڵام:

- وەلاء: وەلاء بریتییە لە خۆشویستنی باوەڕداران، خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ (التوبة ٧١) ڕامانەکەی بە کوردی:" ئیمانداران لە پیاوان و لە ئافرەتان هەندێکیان خۆشەویست و پشتگیر و هاوکاری یەکترین."
- بەڕاء: بەڕاء بریتییە لە خۆشنەویستنی بێباوەڕان و ئەوانەی دژایەتی باوەڕداران دەکەن، خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت:

قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ(الممتحنة ٤)

ڕامانەکەی بە کوردی:" ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت: دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئایینەی ئێوە نییە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە، تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنیا دەهێنن."

---

(۳) بۆ دەوڵەمەندکردنی بابەتەکە، هەردوو جۆری بیدعەکەم بۆ زیاد کردووە. (وەرگێڕ)

پ١٩: هاوەڵ (سەحابە)کێن، ئایا خۆشم بوێن؟

وەڵام: هاوەڵ(سەحابە)، ئەو باوەڕدارانەن؛ کە پێغەمبەریان بینیوە و لەسەر ڕێبازی ئەو مردوون، بۆیە خۆشمان دەوێن و لەسەر ڕێبازی ئەوان دەڕۆین، چونکە باشترین خەڵکن، دوای پێغەمبەر(ﷺ).

باشترینیشیان، هەرچوار جێنشینەکەن، کە بە (خەلیفەی ڕاشیدین) ناسراون، کە ئەمانەن:

- ئەبوبەکر سەدیق ( رضي الله عنه)
- عومەری کوڕی خەتاب (رضي الله عنه)
- عوسمانی کوڕی عەفان (رضي الله عنه)
- عەلی کوڕی ئەبو تالیب (رضي الله عنه)

پ٢٠: ماڵی باوەڕداران کامەیە؟

وەڵام: ماڵی باوەڕداران بەهەشتە، خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: **إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ** (محمد١٢)

ڕامانەکەی بە کوردی:" بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوەچاکەکانیان ئەنجام داوە، خوا دەیانخاتە باخەکانی بەهەشتەوە، کە چەندەها ڕووبار بەناویدا دەڕوات."

پ٢١: ماڵی بێباوەڕان کامەیە؟

وەڵام: دۆزەخ و ئاگرە، خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: **فَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ**(البقرة ٢٤)





ڕامانەکەی بە کوردی: "خۆ ئەگەر نەتانتوانی و هەرگیز نایشتوانن (کەواتە باوەڕبهێنن و) خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی: سووتەمەنییەکەی خڵکی و بەردە، کە بۆ بێباوەڕ و خوانەناسان ئامادە کراوە."

پ٢٢: پێویستە باوەڕدار ترس و تکا (خەوف و رجاء)ی هەبێت، ترس و تکا چییە؟ هیچ بەڵگەیەك لەسەری هەیە؟

وەڵام:

ترس (خەوف): بریتییە لە ترسان لە خوا و سزاکەی.

تکا (رجاء): مرۆڤ تکای وابێت کە پاداشتی خوا بەدەستدەهێنێت و دەکەوێتە بەر سۆز و میهرابانی خوا.

بەڵگە لەسەر ئەمە، خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: **أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا (الاسراء ٥٧)**

ڕامانەکەی بە کوردی:" ئا ئەوانەی کە ئەوان هاناو هاواریان لێ دەکەن، کامیان لە خوا نزیکترە؟! لە کاتێکدا کە ئەوان خۆیان هاوار لە خوا دەکەن و داوای نزیك بوونەوە لە پەروەردگاریان دەخوازن و چاوەڕوانی ڕەحمەتی دەکەن، لە سزا و تۆڵەشی دەترسن، بەڕاستی سزای پەروەردگارت مەترسیی لێکراوە."

هەروەها دەفەرموێت: **نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ (الحجر٤٩-٥٠)**

ڕامانەکەی بە کوردی:" ئەی پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە هەر من بە ڕاستی لێبوردەی میهرەبانم بۆ باوەڕداران."

بێگومان هەر سزا و تۆڵەی منیش، سزا و ئازارێکی زۆر بە ئێشە، ئامادەمکردووە بۆ بێباوەڕ و سەرکەش و یاخییەکان."



پ٢٣: باسی هەندێ لە ناو و سیفەتە بەرزەکانی خوا بکە؟
وەڵام: السَّمِيعُ، البَصِيرُ، العَليمُ، الرَّحْمَنُ، الرَّزَّاقُ، أَلْحَيُّ، الْعَظِيمِ و...هتد لە ناو و سیفەتە بەرزەکانی خوا.

پ٢٤: ئەم ناوانە ڕاڤە بکە؟
وەڵام:
- السَّمِيعُ: هەموو دەنگێ دەبیستێ لەپەنهـــــــــانـــی
- البَصِيرُ: هەموو شتێك دەبینێت بە ورد و درشتییەوە
- العَليمُ : بێحەد زانا و ئاگادارە بەهەموو شتە ئاشکراو پەنهانەکانی ژیان و بوونەوەر
- الرَّحْمَنُ: بەخشندە و میهرەبان و بەسۆزو بەزەییە لە دنیا بەرامبەر بەهەموو شتێك لە بوونەوەردا
- الرَّزَّاقُ: ڕزق و ڕۆزی و بژێوی دەری بێ سنوور و کۆتا بەهەموو دروستکراوەکانی لە مرۆڤ و جنۆکە و زیندەوەرانی دیکە
- أَلْحَيُّ: هەرگیز نامرێت و هەموو دروستکراوێك دەمرێت
- الْعَظِيمِ: زۆر گەورە و مەزن و بەتوانا و بەهێز و بەدەسەڵات و شکۆدارە

پ٢٥: ئایا باوەڕ (ایمان) گوتن و کردارە؟
وەڵام: بەڵێ باوەڕ بریتییە لە گوتن و کردار و بیروباوەڕ.

پ٢٦: ئایا باوەڕ کەم و زیاد دەبێت؟
وەڵام: بەڵێ، باوەڕ بە تاعەتکردن زیاد دەبێت و بەگوناه و تاوانکردنیش کەم دەبێتەوە، خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (الانفال ٢)



ڕامـانەکەی بە کـوردی:" بێگومـان ئیمانـدارانی ڕاسـتەقینە تـەنیا ئەوانـەن: (یەکەم) کە کاتێک ناوی خوا بـرا، ئـەوە دڵـەکانیان دەترسـێت و دەهـەژێت، (دووهەم) کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمـەیان بەسـەردا بخوێنرێتـەوە، ئـەوە ئـیمان و باوەڕیـان زیـاد دەکـات، (سـێهەم) (لـە هـەموو کـار و بارێکیشیاندا) هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن."

پ٢٧: چاکە (احسان) چییە؟

وەڵام: ئیحسان ئەوەیە بەشێوەیەکی وا خواپەرستی بکەی، هەروەك ئەوەی خوا دەبینی، خۆ ئەگەر نەتوانی خوا ببینی، ئەوا خوا دەتبینێت.

پ٢٨: مەرجی قبووڵبوونی کار و کردەوەکان لای خوا چین؟

وەڵام: بەدوو مەرج:

١. ئەگەر بە پاکی و خاڵیسی بۆ خوا کرابێت.
٢. ئەگەر لەسەر ڕێباز و سوننەتی پێغەمبەر(ﷺ) بووبێت.

پ٢٩: پشتبەستن (توکل) بەخوا چییە؟

وەڵام: بریتییە لە پشتبەستن بەخوا بەمەبەستی بەدەستهێنانی سوود و دوورخستنەوەی زیان لەگەڵ گرتنەبەری هۆکارەکان، خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت: وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ (الطلاق٣)

ڕامانەکەی بە کوردی:" ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە، بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت."

(حَسْبُهُۥٓ): واتە ئەو زاتەی بەسە

پ٣٠: فەرمان بەچاکە و نەهی لەخراپە چییە؟

وەڵام:

چاکە (المعروف): بریتییە لە هەموو ملکەچییەك بۆ خوا.

خراپە (المنكر): بریتییە لە هەموو گوناه و تاوانێك.



## بەشی: فیقهـ

پ١: پێناسەی خۆپاککردنەوە (الطهارة) بکە؟

وەڵام: **خۆپاککردنەوەیە لە چڵکی و پیسی.**

طهارة الخبث: **ئەوەیە کە موسڵمان هەموو جۆرە چڵکی و پیسییەك لەسەر جەستە یان جلوبەرگەکانی یاخود ئەو شوێنەی کە نوێژی تێدا دەکات لاببات.**

طهارة الحدث: **ئەوەیە کە لەڕێگەی دەستنوێژهەڵگرتن یان سەرشۆردن بە ئاوی پاك یان تەیەموم کردن (بۆ ئەوانەی کە ئاویان دەستناکەوێت، یان عوزریان هەیە) خۆیان پاك بکەنەوە.**

پ٢: چۆن خۆت لە چڵکی و پیسی پاك دەکەیتەوە؟

وەڵام: **بەشۆردن بەئاو تا پاك دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر چڵکی و پیسییەکە بەهۆی سەگەوە بوو، ئەوا پێویستە حەوت جار بشۆرێت، یەکەمجار بە خۆڵ(گڵ).**

پ٣: خێر و پاداشتی دەستنوێژ چییە؟

وەڵام: **پێغەمبەر(ﷺ) لەبارەی خێر و پاداشتی دەستنوێژهەڵگرتن دەفەرموێت: ئەگەر بەندەی موسڵمان یان باوەڕدار دەستنوێژی هەڵگرت و دەموچاوی خۆی شۆرد، هەر تاوانێکی بە چاوەکانی کردبێت، لەگەڵ ئاخر قەترەی ئاواکە، لە دەموچاوی دەکەوێتە خوارەوە، هەروەها کە**



دەستەکانی شۆرد، هەر تاوانێکی بە دەستەکانی کردبێت، لەگەڵ ئاخر قەترەی ئاواکە، لە دەستەکانی دەکەوێتە خوارەوە، هەروەها کە پێیەکانی شۆرد، هەر تاوانێك کە هەنگاوی بۆ هاوێشتبێت، لەگەڵ ئاخر قەترەی ئاواکە، لە پێیەکانی دەکەوێتە خوارەوە، تاکوو لە گوناهەکانی پاك دەبێتەوە.(٤)

پ٤: چۆن دەستنوێژ هەڵدەگری؟

وەڵام:

١. (٣) جار دەستەکان دەشۆن.
٢. (٣) جار ئاو لە دەم و لووت وەردەدەن.
٣. (٣) جار دەموچاو دەشۆن.
٤. (٣) جار دەستەکان دەشۆن تا ئانیشك.
٥. ئینجا دەستهێنان بەسەردا لەگەڵ هەردوو گوێچکەکان.
٦. ئینجا (٣) جار پێیەکان تا گوزینگ(قولەپێ) دەشۆن.

ئەم جۆرە دەستنوێژەهەڵگرتنە کامیلترین جۆری دەستنوێژە، ئەمە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وارد بووە لە فەرموودەکانی بوخاری و موسلم دا هاتووە، کە عوسمان و عەبدوڵڵای کوڕی زەید و غەیری ئەوانیش گێراویانەتەوە، دیسا لە بوخاری دا هاتووە کە پێغەمبەر(ﷺ) بە یەکجار و دووجاریش دەستنوێژی هەڵگرتووە، واتە هەر ئەندامێکی جەستەی یەکجار یان دووجاری شۆردووە.

(٤) الحديث الثَّالثَ عَشر: عنْ أبي هريرة(رضي الله عنه)، أنَّ رسولَ اللَّه ﷺ قَالَ: إذَا تَوضَّأَ الْعبْدُ الْمُسْلِم، أو الْمُؤْمِنُ فغَسلَ وجْههُ خَرَجَ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خطِيئةٍ نظر إِلَيْهَا بعينهِ مَعَ الْماءِ، أوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْماءِ، فَإِذَا غَسَل يديهِ خَرج مِنْ يديْهِ كُلُّ خَطِيْئَةٍ كانَ بطشتْهَا يداهُ مَعَ الْمَاءِ أَو مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْماءِ، فَإِذَا غسلَ رِجليْهِ خَرجَتْ كُلُّ خَطِيْئَةٍ مشَتْها رِجْلاهُ مَعَ الْماءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ حَتَّى يخْرُج نقِياً مِنَ الذُّنُوبِ ( رواه مسلم)

پ٥: مەرجەکانی دەستنوێژ چین؟ بیان ژمێرە؟

وەڵام: دەستنوێژی موسڵمان بەتاڵ دەبێتەوە، ئەگەر یەکێك لەو مەرجانەی خوارەوەی تێدانەبێت:

١. دەموچاو شۆردن و ئاووەردان لە دەم.
٢. شۆردنی هەردوو دەستەکان تا ئانیشك.
٣. دەستهێنان بەسەر سەر و گوێچکەکاندا.
٤. شۆردنی هەردوو پێ لەگەڵ هەردوو گوزینگ(قولە پێ).
٥. ڕەچاوکردنی ڕێزبەندی ئەندامانی جەستە، واتە سەرەتا دەموچاوەکان، ئینجا دەستەکان، ئینجا مەسحی سەر ئینجا پێیەکان بشۆردرێن.
٦. بەدوایەکدا شۆردنی ئەندامانی جەستە بەبێ دابڕان، واتە پێویستە هەموو ئەندامانی جەستە یەك لە دوای یەك بشۆردرێن بەبێ وەستان و دابڕان، نەك بوەستین تا ئەندامەکانی دیکە وشك دەبنەوە، یاخود نابێ نیوەیان ئێستا و نیوەکەی تر پاش ماوەیەکی دیکە بشۆردرێن.

پ٦: سوننەتەکانی دەستنوێژ چین؟ بیان ژمێرە؟

وەڵام: سوننەتەکانی دەستنوێژ: ئەو سوننەتانەن کە بە کردنیان، موسڵمان و باوەڕدار خێر و پاداشتێکی زیاتری دەستدەکەوێت، بەنەکردنیشیان، تاوان و گوناهیان پێناگات، کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١. ناوی خوا هێنان (بِسْمِ اللَّـهِ).
٢. بەکارهێنانی سیواك.
٣. شۆردنی لەپی دەست.
٤. شۆردنی ناو پەنجەکان.



٥. شۆردانی ئەندامانی جەستە زیاتر لە جارێك
٦. لەلای ڕاستەوە دەست پێبکرێت.
٧. دوعا کردن دوای دەستنوێژ:" أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ وَ أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ."
٨. ئەنجامدانی دوو رکعەت نوێژی سوننەت دوای دەستنوێژ.

پ٧: ئەو شتانەی دەستونێژ بەتاڵ دەکەنەوە بژمێرە؟

وەڵام:

١. هەر شتێك لە پشتەوە و پێشەوەی مرۆڤ دەربچێت، وەك پیسایی و میز و با، دەبێتە هۆی بەتاڵکردنەوەی دەستنوێژ.
٢. نووستن، یان شێتی، یان لەخۆچوون.
٣. خواردنی گۆشتی وشتر.
٤. دەستلێدان لە شوێنی پیسایی و میز (قنگ و ئەندامی زاوزێ)

پ٨: تەیەموم چییە؟

وەڵام: تەیەموم: بریتییە لە بەکارهێنانی خۆڵ، یان شتانی دیکە جگە لە خۆڵ لە ڕووی زەوی، لە کاتی نەبوونی ئاو، یان لەحاڵەتی هەبوونی عوزر بۆ بەکارنەهێنانی ئاو.

پ٩: تەیەموم چۆن دەکرێت؟

وەڵام: یەکجار لەپی دەست دێنن بەخۆڵەکەدا و پشتی دەستەکان و دەموچاوەکانی پێ مەسح دەکەن.



**پ١٠: تەیەموم بەچی بەتاڵ دەبێتەوە؟**

وەڵامر:

١. **هەموو ئەو شتانەی کە دەستنوێژی پێ بەتاڵ دەبێتەوە و پێشتر باسمان کرد.**

٢. **ئەگەر ئاو هەبوو.**

**پ١١: نوێژ چییە؟**

وەڵامر: نوێژ:**بریتییە لە پەرستنی خوا بە وتە و کرداری تایبەت، بە تەکبیر(الله أکبر) دەست پێدەکات و بە سەلامدانەوە کۆتایی دێت.**

**پ١٢: حوکمی نوێژە چییە؟**

وەڵامر: **نوێژ فەرز و واجبکراوە لەسەر هەموو موسڵمانێك.**

**پ١٣: لە شەوو ڕۆژێکدا چەند نوێژ لەسەر موسڵمان واجبە؟**

وەڵامر: **لە شەوو ڕۆژێکدا (٥) نوێژ لەسەر موسڵمان واجبە، نوێژی بەیانی دوو ڕکعەتە، نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکعەتە، نوێژی ئێوارە چوار ڕکعەتە، نوێژی مەغریب سێ ڕکعەتە، نوێژی شێوان چوار ڕکعەتە.**

**پ١٤: مەرجەکانی نوێژ بژمێرە؟**

وەڵامر:

١. **لە ئایینی ئیسلامدا، دەبێت نوێژکەر موسڵمان بێت، بێباوەڕ دروست نییە نوێژ بکات.**





٢. دەبێت کەسەکە عاقڵ بێت، شێت نوێژی لەسەر نییە.

٣. دەبێت بالق و پێگەیشتوو بێت.

٤. نییەت: دەبێت نییەتی نوێژی هێنابێت، چونکە نوێژ بەبێ نییەت دروست نییە.

٥. دەبێت لە کاتی بەرپاکردنی نوێژ، کاتەکەی هاتبێت.

٦. دەبێت نوێژخوێن دەستنوێژی هەبێت.

٧. دەبێت نوێژخوێن خۆی لە چڵکی و پیسی پاك بکاتەوە.

٨. عەورەتی خۆی داپۆشێت.

٩. ڕوو لە قیبلە بکات.

پ١٥: پایەکانی نوێژ بژمێرە؟

وەڵام: نوێژ چواردە پایەی هەیە، کە ئەمانەن:

١. نوێژە فەرزەکان پێویستە بە پێوە ئەنجام بدرێن، ئەگەر نوێژخوێنەکە توانای هەبوو.

٢. تەکبیرکردن لە کاتی بەرپاکردنی نوێژ، کە بریتییە لە (الله أكبر).

٣. خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە.

٤. ڕکوع، کە هەردوو دەستی لەسەر هەردوو ئەژنۆی دادەنێت و سەریشی لەئاست ئەژنۆکانی دەبێت.

٥. هەستانەوە لە ڕکوع.

٦. خۆڕاستکردنەوە دوای ڕکوع.

٧. کڕنۆش(سوجدە)، پێویستە نوێژخوێن لەسەر ئەم حەوت ئەندامانەی جەستە سوجدە ببات، کە بریتین لەمانە:(نێوچەوان، هەردوو لەپی دەست،لووت، هەردوو ئەژنۆ، پەنجەکانی هەردوو پێ.)

٨. هەستانەوە لە سوجدە.

٩. دانیشتن لە نێوان دوو سوجدە، سوننەت وایە نوێژخوێن پێی چەپی ڕابخات و قاچی ڕاستیشی ڕووی لە قیبلە بێت.

١٠. ئۆقرەگرتن و وەستان لە پاش ئەنجامدانی هەر پایەکی نوێژ.

١١. شایەتمانی کۆتایی (تەحیات).

١٢.دانیشتن بۆ خوێندنەوەی تەحیات.

١٣. سەلامدانەوە بەلای ڕاست و چەپدا، کە بریتییە لە (السَّلاَمُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللهِ).

١٤.ڕێزبەندیکردنی پایەکانی نوێژ، واتە یەك بەدوای یەکدابێن، هەڵبەت ئەگەر بەئەنقەست پێش ڕکوع، سوجدەی برد، ئەوا نوێژەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بەئەنقەست نەبوو، بەڵکوو لەبیری کردبوو، ئەوا دەبێ بگەڕێتەوە سەرەتا ڕکوع ببات ئینجا بچێتە سوجدە.

پ١٦: ئەرك و واجبەکانی نوێژ چین؟

وەڵام: ئەرك و واجبەکانی نوێژ هەشتن، کە بریتین لەمانە:

١. وتنی تەکبیرەکان، جگە لە تەکبیری نوێژدابەستن، واتە لە کاتی هەستانەوە و دانیشتن و دوای ڕکوع و سوجدە و تەحیات و فاتیحە خوێندن، پێویستە نوێژخوێن بڵێت (الله أكبر).

٢. پێویستە ئیمام یان ئەوەی پێشنوێژ دەکات، هەروەها ئەوەیش کە بەتەنیا نوێژ دەکات، لە کاتی هەستانەوە لە ركوع بڵێت: (سمع الله لمن حمده).

٣. پێویستە ئەوانەی لە دوای ئیمام نوێژ دەکەن، لە کاتی هەستانەوە لە ڕکوع، کە ئیمام وتی: (سمع الله لمن حمده)، ئەوانیش بڵێن: (ربنا ولك الحمد).



٤. لە کاتی چوون بۆ ڕکوع، پێویستە یەکجار بڵێن: (سبحان ربی العظیم).

٥. لە کاتی چوون بۆ سوجدە، پێویستە یەکجار بڵێن: (سبحان ربی الأعلی).

٦. لە نێوان هەردوو سوجدەدا، پێویستە بڵێن:(رب أغفر لی).

٧. خوێندنی تەحیاتی یەکەم.

٨. دانیشتن بۆ تەحیاتی یەکەم.

پ١٧: سوننەتەکانی نوێژ چین؟

وەڵام: سوننەتەکانی نوێژ یانزدەن، کە بریتین لەمانە:

١. سوننەتە دوای تەکبیر (الله أکبر)ی نوێژدابەستن، بوترێت: "سبحانك اللهمّ وبحمدك، وتبارك اسمك، وتعالی جدّك، ولا إله غیرك)." کە بە دوعای دەستپێکردن باوە.

٢. خوێندنی (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) لە دەستپێکی خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە.

٣. خوێندنی (بسم الله الرحمن الرحیم) لە دەستپێکی خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە، دوای (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم).

٤. سوننەتە دوای خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە بڵێن (ئامین).

٥. سوننەتە دوای خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە، سورەتێکی دیکە بخوێندرێتەوە.

٦. سوننەتە ئیمام (پێشنوێژ) لە کاتی بەرپاکردنی نوێژەکان، بەدەنگی بەرز سورەتی فاتیحە بخوێنێتەوە.

٧. سوننەتە ئیمام دوای (التحمید)، واتە حەمد و ستایشی خوا بکات، ئینجا بڵێت: "ربَّنا لك الحمدُ ملْءَ السَّمواتِ والأرضِ، وملْءَ ما شِئتَ مِن شيءٍ



بعدُ."، هەروەها ئەوەی ڕاستی بێت، سوننەت وایە نوێژخوێن (مەئموم)ەکانیش کە لە دوای ئیمامەوە نوێژ دەکەن ئەم زیکرە بکەن.

٨. زیاتر لە جارێك لە رکوع بوترێت (سبحان ربی العظیم)، واتە جارێك و دووجار و سێجار و ...هتد.

٩. زیاتر لە جارێك لە سوجدە بوترێت (سبحان ربی الأعلی)، واتە جارێك و دووجار و سێجار و ...هتد.

١٠. زیاتر لە جارێك لە نێوان دوو سوجدەدا بوترێت: (رب أغفر لی).

١١. سەلەوات دان لەسەر ئاڵی پێغەمبەر (ﷺ) لە تەحیاتی کۆتایی، واتە سەلەواتیان لەسەر لێبدرێت و دوعایان بۆ بکرێت کە خوا بەرەکەت بڕژێنێت بەسەریاندا و دوعایایان بۆ بکرێت.

سوننەتە کردارییەکان:

١. بەرزکردنەوە دەستەکان لە کاتی دابەستنی نوێژ و وتنی (الله أکبر).

٢. بەرزکردنەوەی دەستەکان لە کاتی چوون بۆ ڕکوع.

٣. بەرزکردنەوەی دەستەکان لە کاتی هەستانەوە لە ڕکوع.

٤. شۆڕکردنەوەی دەستەکان لە پاش بەرزکردنەوەیان.

٥. دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ لە کاتی نوێژ.

٦. تەماشاکردنی شوێنی سوجدە.

٧. پێیەکانی فاسیلەیان هەبێت، کاتێك کە بەپێوەیە.

٨. پەنجەکانی دەست بخاتە سەر ئەژنۆکانی لە ڕکوع دا، هەروەها ڕاگرتنی سەریش لە ئاست پشتدا لە کڕنۆشدا .

٩. بەرزکردنەوەی هەردوو قۆڵ لە زەوی لە کاتی سوجدەدا.



١٠. دوورخستنەوەی هەردوو بازوو لە هەردوو لاکەلەکە، هەروەها دوورخستـنەوەی سـك لە هەردوو ڕان، دیسان دوورخستنەوەی هەردوو ڕان لە هەردوو قاچ لە سوجدەدا.

١١. دانیشتنی نوێژخوێن لەسەر پێی چەپی بەڕاخراوەیی، هەروەها چەقاندنی پێی ڕاستی بەزەویدا لە تەحیاتی یەکەم و لە نێوان هەردوو سوجدەکەدا.

١٢. سوننەتە نوێژخوێن لە کاتی هەستانەوە لە سوجدە و لە نێوان هەردوو سوجدەدا، هەردوو دەستی لەسەر ڕانەکانی بەکراوەیی دابنێت و پەنجەکانی دەستیشی بەیەکەوە بنووسێنێت، هەروەها لە تەحیاتیشدا، بەڵام لە کاتی خوێندنەوەی تەحیات، پەنجەکانی دەستی ڕاستی دەچەمێنێتەوە، جگە لە پەنجەگەورە و شایەتمان نەبێت، لە کاتی شایەتمان پەنجەی شایەتمان دەجووڵێنێت و ئاماژە بە زیکری خوا دەکات.

١٣. ئاوڕدانەوە بەلای ڕاست و بەلای چەپدا لە کاتی سەلامدانەوە لە نوێژ.

پ١٨: بەتاڵکەرەوەکانی نوێژ بژمێرە؟

وەڵام:

١. وازهێنان لە پایەك یان مەرجێك لە مەرجەکانی نوێژ.

٢. قسەکردنی بە ئەنقەست لە نوێژدا.

٣. خواردن یان خواردنەوە لە نوێژدا.

٤. زۆر جووڵەکردنی یەك لەدوای یەك لە نوێژدا.

پ١٩: موسڵمان چۆن نوێژ دەکات؟

وەڵام: چۆنیەتی نوێژکردن:



١. پێویستە نوێژخوێن بەتەواوی ڕوو لە قیبلە بکات.

٢. ئینجا پێش دابەستنی نوێژ، نیيەتی ئەو نوێژە بێنێت، نیيەتەکەش بەدڵ بێت نەك بە زمان.

٣. ئینجا تەکبیر (الله أکبر)ی نوێژدابەستن بکات و دەستەکانی تا ئاستی شانەکانی بەرز بکاتەوە.

٤. ئینجا لەپی دەستی ڕاستی بخاتە سەر پشتی دەستی چەپی و لەسەر سینگی دایبنێت.

٥. ئینجا بەم دوعایە دەست پێبکات و بڵێت: " اللَّهُمَّ بَاعِدْ بَيْنِي وَبَيْنَ خَطَايَايَ كَمَا بَاعَدْتَ بَيْنَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ، اللَّهُمَّ نَقِّنِي مِنْ خَطَايَايَ كَمَا يُنَقَّى الثَّوْبُ الأَبْيَضُ مِنَ الدَّنَسِ، اللَّهُمَّ اغْسِلْنِي مِنْ خَطَايَايَ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ."

یاخود بڵێت: "سبحانك اللهم وبحمدك، وتبارك اسمك، وتعالى جدّك، ولا إله غيرك."

٦. ئینجا ئەعوزو بیللا بڵێت:"أعوذ بالله من الشيطان الرجيم."

٧. ئینجا (بیسم الله) بکات و دەست بە خوێندنەوەی سورەتی فاتیحە بکات، بەمشێوەیە: بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ٱهْدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلْمُسْتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ غَيْرِ ٱلْمَغْضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ (الفاتحة ١-٧)، ئینجا بڵێت (ئامین).

٨. ئینجا دەست بە خوێندنەوەی قورئان بکات و لە نوێژی بەیانیدا، قورئانێکی زیاتر بخوێنێتەوە.

٩. ئینجا بچێتە ڕکوع، واتە خۆی بچەمێنێتەوە لەسەر ئەژنۆ، بۆ بەگەورەزانینی خوا، هەروەها کە دەچێتە ڕکوع بڵێت (الله أکبر) و دەستەکانیشی تا ئاستی شانەکانی بەرز بکاتەوە.



سوننەتیش وایە پشتی ڕاست بێت و سەری لە ئاست پشتەکەی بێت و دەستەکانیشی لەسەر ئەژنۆکانی دابنێت و پەنجەی دەستەکانی کراوە و فڕبن.

١٠. لە چوونە ڕکوعدا سێ جار یان زیاتر بڵێت: (سبحان ربى العظيم)، ئەگەر ئەمەشی بۆ زیاد بکات باشترە:"سبحانك اللهم وبحمدك، اللهم أغفر لى."

١١. ئینجا سەری لە ڕکوع بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: (سمع الله لمن حمده)، دەستەکانیشی تا ئاستی شانەکانی بەرز دەکاتەوە، مەئمومیش، واتە ئەوەی لە دوای ئیمام نوێژ دەکات، ناڵێت:(سمع الله لمن حمده)، بەڵکوو دەڵێت(ربنا ولك الحمد).

١٢. ئینجا دوای هەستانەوە لە ڕکوع دەڵێت: (ربنا ولك الحمد، ملء السماوات و الارض، وملء ما شئت من شیء بعد).

١٣. ئینجا دەچێتە سوجدەی یەکەم و لە سوجدەدا دەڵێت (الله أكبر)، ئینجا لەسەر هەر حەوت ئەندامەکانی سوجدە دەبات، کە بریتین لەمانە: (نێوچەوان، لووت، هەردوو لەپی دەست، هەردوو ئەژنۆ و پەنجەکانی هەردوو پێ.) هەروەها بازووەکانت لە تەنیشتەکان دووربخەرەوە، قۆڵەکانت لەسەر زەوی ڕامەخەوە و سەرە پەنجەکانیشت ڕوو لە قیبلە بێت.

١٤. لە چوونە ڕکوعدا سێ جار دەڵێت: (سبحان ربى الأعلى)، ئەگەر ئەمەشی بۆ زیاد بکات باشترە:"سبحانك اللهم وبحمدك، اللهم أغفر لى."

١٥. ئینجا سەری لە سوجدە بەرز دەکاتەوە و دەڵێت: (الله أكبر).

١٦. ئینجا لە نێوان دوو سوجدەدا دادەنیشێت و پێی چەپی ڕادەخات و پێی ڕاستی بەزەویدا دەچەقێنێت، دەستی ڕاستیشی لەسەر ڕانی ڕاستی دادەنێت



و پەنجەکانی دەستی دەچەمێنێتەوە، جگە لە پەنجەگەورە و شایەتمان نەبێت، وەك ئەڵقەی لێدێت، دەستی چەپیشی لەسەر ڕانی چەپی دادەنێت و پەنجەکانی بەکراوەیی دەهێڵێتەوە.

١٧. لە نێوان هەردوو سوجدەدا دەڵێت:(رب اغفر لي، و ارحمني، و اهدني، و ارزقني، و اجبرني، و عافني.)

١٨. ئینجا بۆ جاری دووەم دەچێتەوە سوجدە و وەك جاری یەکەم زیکرەکان دەڵێتەوە و (الله أكبر) دەڵێتەوە.

١٩. ئینجا لە سوجدەی دووەم هەڵدەستێتەوە و دەڵێت (الله أكبر)، پاشان دەست بە ڕکعەتی دووەم دەکاتەوە وەك ڕکعەتی یەکەم، بەڵام لە ڕکعەتی دووەمدا دوعای دەست پێکردن ناخوێنێتەوە.

٢٠. ئینجا دوای تەواوبوونی ڕکعەتی دووەم، دادەنیشێت و دەڵێت :(الله أكبر) و بە هەمان شێوەی دانیشتنی نێوان دوو سوجدە دادەنیشێت.

٢١. ئینجا تەحیاتی یەکەم دەخوێنێتەوە و دەڵێت:" التحيات لله والصلوات والطيبات السلام عليك ايها النبي ورحمة الله وبركاته، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين، أشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، اللهم صل على محمد وعلى ىل محمد، كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم، وبارك على محمد وعلى آل محمد، كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم، إنك حميد مجيد، أعوذ بالله من عذب جهنم و من عذب القبر. ومن فتنة المحيا و الممات، ومن الفتنة المسيح الدجال." ئینجا لە خوای خۆی دەپاڕێتەوە، کە خێری دنیا و قیامەتی پێ ببەخشێت.



٢٢. ئینجا بەلای ڕاستدا سەلام دەداتەوە و دەڵێت:(السلام علیکم و رحمة الله)، ئینجا بەلای چەپدا سەلام دەداتەوە و دەڵێت :(السلام علیکم و رحمة الله.)

٢٣. بەڵام ئەگەر نوێژەکە سێ ڕکعەت یان چوار ڕکعەت بوو، ئەوا تەحیاتی یەکەم تا :"أشهد أن لا الله الا الله و أشهد أن محمدا عبده و رسوله" دەخوێنێتەوە.

٢٤. ئینجا هەڵدەستێتەوە و دەڵێت (الله أكبر)، دەستەکانیشی تا ئاستی شانەکانی بەرز دەکاتەوە.

٢٥. ئینجا درێژە بەنوێژەکەی دەدات، هەروەك ڕکعەتی دووەم، بەڵام تەنیا سورەتی فاتیحە دەخوێنێتـەوە.

٢٦. ئینجا نوێژخوێن کلۆك (سەرووی ئەژنۆ)ی چەپی لەسەر زەوی دادەنێت، پێی ڕاستی دەچەقێنێت و پێی چەپیشی لەژێر ڕان و ئەژنۆی ڕاستی دەهێنێتە دەرەوە.

٢٧. ئینجا لە تەحیاتی دووەم، هەموو تەحیاتەکە بە کامیلی دەخوێنێتەوە.

٢٨. ئینجا بەلای ڕاست و بەلای چەپدا سەلام دەداتەوە و دەڵێت:(السلام علیکم و رحمة الله.)

پ٢٠: نوێژە سونەتە ڕاتبەکان کامانەن؟

وەڵام:

- دوو ڕکعەت پێش نوێژی بەیانی
- چوار ڕکعەت پێش نوێژی نیوەڕۆ



- دوو ڕکعەت پاش نوێژی نیوەڕۆ
- دوو ڕکعەت پاش نوێژی مەغریب
- دوو ڕکعەت پاش نوێژی شێوان

پ٢١: خشوع لە نوێژدا چییە؟

وەڵام: خشوع: بریتییە لە ئوقرەگرتنی ئەندامانی جەستە لە نوێژدا، کە دڵ پەیوەست بێت بە نوێژەکەوە.

پ٢٢: پێناسەی زەکات بکە؟

وەڵام: زەکات بریتییە لە مافێکی واجبکراو لە ماڵێکی تایبەت، بۆ هەندێ کەسی تایبەت لە کاتێکی تایبەت، هەروەها زەکات یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام و فەرزێکە، لە دەوڵەمەندەکانەوە وەردەگیرێت و دەدرێت بە هەژارەکان.

پ٢٣: سەدەقەی سوننەت (المستحب) چییە؟

وەڵام: بریتییە لە پارەی غەیرە زەکات، کە لەپێناو خوا و بەمەبەستی بەدەستهێنانی خێر و پاداشت دەبەخشرێت بە هەژاران و لێقەوماوان.

پ٢٤: پێناسەی ڕۆژوو بکە؟

وەڵام: ڕۆژوو بریتییە لە بەندایەتی کردن بۆ خودا بە خۆگرتنەوە و خۆپارێزیی لەهەموو ئەو شتانەی ڕۆژوو بەتاڵ دەکەنەوە لە دەرکەوتنی فەجرەوە، تاکوو خۆر ئاوابوون.





ڕۆژوو دوو جۆرە:

١. ڕۆژووی واجب: **وەك بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان، کە پایەکە لە پایەکانی ئیسلام.**

٢. ڕۆژووی سوننەت: **وەك بەڕۆژووبوونی ڕۆژانی دووشەممە و پێنجشەممە لە هەموو مانگێك دا.**

**پ٢٥: پێناسەی حەج و عومرە بکە؟**

وەڵام:

حەج **بریتییە لە بەندایەتی کردن بۆ خودا، بە چوون بۆ ماڵی خوا، لەکاتێکی دیاریکراودا، بۆ ئەنجامدانی هەندێ کاری تایبەت لە کاتێکی تایبەتدا.**

عومرە: **بریتییە لە بەندایەتی کردن بۆ خودا، بە چوون بۆ ماڵی خوا، بۆ ئەنجامدانی هەندێ کاری تایبەت، لە هەر کات و ساتێکدا بێت.**

**پ٢٦: جیهاد چییە؟**

وەڵام: جیهاد **بریتییە لە هەر گوتنێك یان کردارێك، کە مەبەست لێی بڵاوکردنەوەی ئیسلام بێت، یان بەرگریکردن بێت لێی، یان لە خەڵکەکەی، یان شەڕکردن دژی ئەوانەی شەڕی ئیسلام و خەڵکەکەی دەکەن.**



## بەشی ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ)

پ١: ڕەچەڵەك (نەسەب)ی پێغەمبەرمان محەمەد (ﷺ) چییە؟
وەڵام: **محەمەد(ﷺ) کوڕی عەبدوڵڵایە، عەبدوڵڵا کوڕی عەبدولموتەلیبە، عەبدولموتەلیب کوڕی هاشمە، هاشمیش لە قورەیشە، قورەشیش لە عەرەبە، عەرەبیش لە نەوەی ئیسماعیلە، ئیسماعیلیش کوڕی ئیبراهیم پێغەمبەرە، دروودی خوا لەسەر ئەوان و پێغەمبەرمان بێت.**

پ٢: ناوی دایکی پێغەمبەرمان (ﷺ) چییە؟
وەڵام: **(ئامینای کچی وەهەب)ە**

پ٣: باوکی کەی وەفاتی کردووە؟
وەڵام: **باوکی پێغەمبەر (ﷺ) لە شاری مەدینە وەفاتی کردووە، کە ئەو هێشتا لەناو سکی دایکیدا بوو و لەدایك نەبوو بوو.**

پ٤: پێغەمبەر (ﷺ) کەی لەدایك بووە؟
وەڵام: **ساڵی فیل، مانگی ڕەبیعی یەکەم، ڕۆژی دووشممە.**

پ٥: پێغەمبەر (ﷺ) لە چ شارێك لەدایك بووە؟
وەڵام: **لە شاری مەککە.**





پ٦: جگە لە دایکی، کێ شیری بە پێغەمبەر (ﷺ)داوە و دایانی بووە؟

وەڵام:

- ئوم ئەیمەنی خزمەتکاری باوکی
- سوەیبەی خزمەتکاری ئەبو لەهەبی مامی
- حەلیمەی سەعدییە

پ٧: دایکی پێغەمبەر (ﷺ) کەی وەفاتی کردووە؟

وەڵام: کە دایکی وەفاتی کرد، تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ)شەش ساڵ بوو، عەبدولموتەلیبی باپیری ئەرکی بەخێوکردنی پێغەمبەری گرتە ئەستۆی خۆی.

پ٨: دوای مردنی عەبدولموتەلیب، کێ پێغەمبەری بەخێوکرد؟

وەڵام: کە عەبدولموتەلیبی باپیری وەفاتی کرد، تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) هەشت ساڵ بوو، بۆیە ئەبو تالیبی مامی ئەرکی بەخێوکردنی گرتە ئەستۆی خۆی.

پ٩: پێغەمبەر (ﷺ) کەی لەگەڵ مامی سەفەری کرد بۆ شام؟

وەڵام: لەتەمەنی دوانزدە ساڵی لەگەڵ مامی سەفەری کرد بۆ شام.

پ١٠: دووەم سەفەری پێغەمبەر (ﷺ) کەی بوو؟

وەڵام: دووەم سەفەری پێغەمبەر (ﷺ)، لە تەمەنی (٢٥) ساڵیدا بوو، کە بەپارەی خەدیجە(خوا لێی ڕازی بێت) چوو بوو بۆ کاری بازرگانی، کە گەڕایەوە خەدیجەی مارە کرد.



پ١١: قورەیشییەکان کەی کەعبەیان بیناکردەوە؟
وەڵام: کە قورەیشییەکان کەعبەیان بیناکردەوە، تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) سی و پێنج ساڵ بوو.
پێغەمبەر (ﷺ) بوو بە دادوەر لە نێوانیاندا، لەسەر ئەوەی کێ بەردەکە بخاتە شوێنی خۆی، ئەوەبوو پێغەمبەر پارچە قوماشێکی هێنا و فەرمان کرد بە هەرچوار بنەماڵەکە، ئەوکاتە چوار بنەماڵە لە شاری مەککەدا هەبوون، کە هەر بنەماڵەیەك گۆشەیەکی قوماشەکە بگرێت و بەرزی بکاتەوە، تا بەردەکە دەکەوێتە شوێنی خۆی، ئینجا کە بەرزیان کردەوە، پێغەمبەر بەدەستی خۆی بەردەکەی لە شوێنی خۆی دانا.

پ١٢: تەمەنی پێغەمبەر (ﷺ) چەند بوو، کە کرا بە پێغەمبەر، هەروەها بۆ کێ ڕەوانەکراوە؟
وەڵام: تەمەنی (٤٠) ساڵ بوو کە کرا بە پێغەمبەر، بۆ گشت جیهانیانیش ڕەوانەکراوە، وەك مژدەدەر و ترسێنەر (بَشِيراً وَنَذِيرًا).

پ١٣: دەستپێکی نیگا (وەحی)، بەچی دەستی پێکرد؟
وەڵام: بە خەونی ڕاستەقینە، خەونەکان وەک پرشنگی بەرەبەیان دەهاتە دی.

پ١٤: دۆخی پێغەمبەرمان(ﷺ)، پێش دابەزینی وەحی چۆن بوو؟ هەروەها یەکەمجار کە (وەحی)ی بۆ دابەزی کەی بوو؟
وەڵام: پێغەمبەر (ﷺ) پێش دابەزینی وەحی لە ئەشکەوتی (حەڕا)دا خەریکی خواپەرستی بوو، هەر لە ئەشکەوتیشدا بوو، کە وەحی)ی بۆ دابەزی.

پ١٥: یەکەمین سورەتی قورئان کە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) دابەزی کامە بوو؟
وەڵام: سورەتی (العلق)، کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ (العلق ١-٥).

ڕامانەکەی بە کوردی:" **ئەی محەمەد (ﷺ) بخوێنە بەناوی ئەو پەروەردگارەتەوە کە هەموو شتێکی دروست کردووە، ئادەمیزادی لە چەند خانەیەکی هەڵواسراو (لەناو منداڵداندا) دروست کردووە، بخوێنە، لە کاتێکدا هەر پەروەردگاری تۆ بەخشندەیە، ئەو زاتەیە کە بەهۆی قەڵەمەوە زانست و زانیاریی فێرکردووە، ئادەمیزادی فێری ئەو شتانە کردووە کە نەیزانیوون.**"

پ١٦: کێ یەکەم کەس بوو کە باوەڕی بە پێغەمبەر (ﷺ) هێنا؟
وەڵام: لە پیاوان: ئەبوبەکری سەدیق، لە ژنانیش: خەدیجەی کچی خوەیلد، لە نێوجەوانانیش: عەلی کوڕی ئەبو تالیب، لە خزمەتکارانیش: زەیدی کوڕی حاریسە، لە بەندەکانیش: بیلالی حەبەشی، خوا لە وان و ئەوانی دیکەش خۆش بێت.

پ١٧: سەرەتای دابەزینی وەحی، بانگکردنی خەڵك بۆ ئیسلام چۆن بوو؟
وەڵام: سێ ساڵی یەکەمی، بانگەوازەکەی بەنهێنی و شاراوە بوو، بەڵام دوای سێ ساڵ، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی دا کە بەئاشکرایی خەڵك بانگ بکرێت بۆ ئیسلام.



**پ١٨: دۆخی پێغەمبەر و باوەڕداران چۆن بوو، دوای ئەوەی بە ئاشکرا خەڵك بانگکرا بۆ هاتنە ناو ئیسلام؟**
وەڵام: بتپەرستەکان زۆر ئازاری پێغەمبەر و موسڵمانانیان دا، تەنانەت بەهۆی ئەو ئەزیەت و ئازارەوە، پێغەمبەر ڕێگای بە باوەڕداراندا کە کۆچ بکەن بۆ لای (نەجاشی)ی پاشای حەبەشە.
بتپەرستەکان کۆدەنگ بوون لەسەر کوشتنی پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵام خوا پاراستی و ئەبو تالیبی مامیشی بەرگریی لێکرد.

**پ١٩: کێ لە دەیەمین ساڵی پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەرادا(ﷺ) وەفاتی کرد؟**
وەڵام: ئەبو تالیبی مامی وەفاتی کرد، هەروەها خەدیجەی هاوسەریشی کۆچی دوایی کرد (خوا لێی ڕازی بێت).

**پ٢٠: ئیسرا و میعراج کەی بوو؟**
وەڵام: پێغەمبەر(ﷺ) لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا بوو، کە ئیسرا و میعراجی کرد.
ئیسرا: بریتییە لە شەوڕوویی پێغەمبەر لە مزگەوتی حەرام (کەعبە)، بۆ مزگەوتی ئەقسا لە شاری (قودس) لە فەڵەستین.
میعراج: بریتییە لە بەرزبوونەوەی پێغەمبەر (ﷺ)، لە مزگەوتی حەرام (کەعبە)، بۆ ئاسمان لە (سدرة المنتهى).

**پ٢١: پێغەمبەر (ﷺ)، چۆن خەڵکی دەرەوەی مەککەی بانگهێشت دەکرد بۆ ئیسلام؟**
وەڵام: سەرەتا بەبانگکردنی خەڵکی تائیف دەستی پێکرد، ئینجا کە شاندەکان دەهاتنە مەککە لە وەرزە تایبەتەکان، یان بۆ کاری بازرگانی، پێغەمبەر (ﷺ)، خۆی پێ دەناساندن و بانگهێشتی دەکردن بۆ ئیسلام، هەتا ئەنسارەکانی خەڵکی شاری مەدینە هاتن، باوەڕیان بە پەیامی پێغەمبەر (ﷺ) هێنا.



پ٢٢: پێغەمبەر (ﷺ)، چەند ساڵ لە مەککە مایەوە و خەریکی بانگەواز بوو؟

وەڵام: (١٣) ساڵ مایەوە.

پ٣٤: پێغەمبەر (ﷺ) بۆ کوێ کۆچی کرد؟

وەڵام: پێغەمبەر (ﷺ) لە مەککەوە کۆچی کرد بۆ شاری مەدینە.

پ٢٤: پێغەمبەر (ﷺ) چەند ساڵ لە مەدینە مایەوە؟

وەڵام: (١٠) ساڵ

پ٢٥: لە شاری مەدینە، چی لە شەریعەتی ئیسلام لەسەر پێغەمبەر فەرز کرا؟

وەڵام: نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و جیهاد و بانگ و ...هتد لە شەریعەتی ئیسلام لەسەری فەرزکرا.

پ٢٦: گرنگترین غەزایەکانی پێغەمبەر (ﷺ) کامانەن؟

وەڵام: گرنگترین غەزایەکانی پێغەمبەر ئەمانەبوون:

- غەزای بەدری مەزن
- غەزای ئوحود
- غەزای ئەحزاب
- غەزای بەنو قوڕەیزە
- غەزای فەتحی مەککە



پ٢٧: کۆتا ئایەتی قورئانی پیرۆز، کە بۆ پێغەمبەر دابەزی، کامەبوو؟

وەڵام: **وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ (البقرة ٢٨١)**

ڕامانەکەی بە کوردی: **" خەڵکینە لە سزا و تۆڵەی ڕۆژێک بترسن، کە تیایدا بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، لەوەودوا هەموو کەس پاداشتی کاروکردەوەی خۆی وەردەگرێت و ستەمیان لێ ناکرێت."**

پ٢٨: پێغەمبەر (ﷺ) کەی کۆچی دوایی کرد و تەمەنی چەندبوو کە کۆچی دوایی کرد؟

وەڵام: پێغەمبەر (ﷺ) لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی یازدەی کۆچی و لە تەمەنی (٦٣) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

پ٢٩: ناوی هەندێك لە هاوسەرانی پێغەمبەر(ﷺ) بژمێرە؟

وەڵام:

- خەدیجە (خوا لێی ڕازی بێت)
- عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت)
- ئوم سەلەمە (خوا لێی ڕازی بێت)
- حەفسە (خوا لێی ڕازی بێت)

پ٣٠: ناوی منداڵەکانی پێغەمبەر بنووسە؟

وەڵام:

کوڕەکانی بریتین لەمانە:





- قاسم، پێغەمبەر (ﷺ) بە (أبو القاسم)بانگ دەکرا.
- عەبدوڵلا
- ئیبراهیم

کچەکانیشی بریتین لەمانە:

- فاتیمە
- ڕەقییە
- ئوم کەلسوم
- زەینەب

تێبینی: گشت منداڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە خەدیجەی هاوسەری بوون (خوا لێی ڕازی بێت)، جگە لە ئیبراهیم، گشت منداڵەکانیشی پێش ئەو وەفاتیان کردووە، جگە لە فاتیمە، کە دوای شەش مانگ لە کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ)، ئەویش وەفاتی کرد.

پ٣١: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر چی ئوممەتەکەی جێهێشت؟

وەڵام: پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر بەڵگەیەکی سپی و ڕووناك ئوممەتەکەی جێهێشت، کە شەوەکەی وەك ڕۆژەکەی وابوو، هەرکەسێك لە ڕێبازەکەی لابدات بەهیلاك دەچێت، چونکە هەرشتێك خێری تێدابووبێت، ئەوا بە ئوممەتەکەی گەیاندووە، هەرشتێکیش شەڕ و خراپەبووبێت، ئەوا ئوممەتەکەی لێی ئاگادار کردووەتەوە.



## بەشی ڕاڤە (تەفسیر)

پ١: سورەتی (الفاتحة) بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟

وەڵام: **بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ** (الفاتحة ١-٧)

ڕامانەکەی بە کوردی:" بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان (بە ناوی ئەو خوایەی کانگای ڕەحمەت و سۆز و بەزەییە). (١)

سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و بۆ خوایە، کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بوونەوەرە. (٢)

بەخشندەی میهرەبان، کانگای ڕەحمەت و میهرەبانییە (ڕەحمەتی لە دنیادا هەموو شتێکی گرتۆتەوە، بەڵام لە قیامەتدا تەنیا بۆ ئیماندارانە). (٣)

خاوەن و سەرداری ڕۆژی پاداشت و سزایە (پادشای ڕۆژی قیامەتە، کە دادپەروەریی ڕەها و بێ سنووری تێدا بەرپا دەکات). (٤)

خوایە، تەنیا هەر تۆ دەپەرستین و هەر لە تۆش داوای یارمەتی و پشتیوانی دەکەین (لە کاروباری دین و دنیاماندا، بە کەسی تر لە بەندەکانت ناکرێت). (٥)

خوایە بەردەوام ڕێنموویيمان بفەرموو بۆ ئەم ڕێبازە ڕاست و دروستەی ئیسلام. (٦)

کە بەرنامە و ڕێبازی ئەوانەیە لە نازو نیعمەتی خۆت بەهرەوەرت کردوون، نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەی خەشم و قینیان لێگیراوە (بەهۆی ئەوەوە



دەیزانن و لایانداوە)، هەروەها نەمانخەیتە سەر ڕێبازی ئەوانەش، کە سەرگەردان و گومڕان (بەهۆی لاساری و یاخیبوون و نەزانینیانەوە." (٧)

پ٢: سورەتی (الاخلاص) بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟

وەڵام: **قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ (١-٤)**

ڕامانەکەی بە کوردی:" ئەی محەمەد (ﷺ) ئەی ئیماندار بڵێ: ئەو خوایەی کە ناوی (الله)، خوایەکی تاک و تەنیایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە). (١)

خوا زاتێکی پایەدار و دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نییە و هەموویان ئاتاج و محتاجی ئەون، هەر ئەو دەتوانێ بەڵاو و ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازیەکانمان جێبەجێ بکات. (٢)

هیچ کەسی لێ نەبووە و خۆیشی لە کەس نەبووە. (٣)

هەرگیز هاوتاو و هاوشێوە و دەسەڵاتدارێکی تر نییە، کە لەبەرامبەریەوە بەوەستێت و هاوشانی بێت."(٤)

پ٣: سورەتی (الفلق) بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟

وەڵام: **قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ (الفلق ١-٥)**

ڕامانەکەی بە کوردی: ئەی محەمەد (ﷺ) ئەی ئیماندار بڵێ: پەنا دەگرم بەو پەروەردگارەی کە بەرەبەیان پێش دەهێنێت. (١)

لە شەڕ و خراپەی هەرچی کە دروستی کردووە (لە پەری و ئادەمیزاد و مار و مێرو). (٢)

لە شەڕ و خراپەی شەو، کاتێ کە دادێت و دنیا تارک دەبێت و دەبێتە شەوەزەنگ. (٣)



لە شەڕ و خراپەی ئەو کەسانەی کە جادوو دەکەن و پەت و دەزوو گرێ دەدەن و فووی پیادەکەن (بەفێڵ و جادوو نێوانی خەڵکی تێک دەدەن). (٤)
لە شەڕ و خراپەی حەسوود و بەخیل، کاتێ کە حەسوودی و بەخیلی دەبات. (٥)

پ٤: سورەتی (الناس) بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟
وەڵام: **قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ مَلِكِ ٱلنَّاسِ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ** (الناس ١-٦)
ڕامانەکەی بە کوردی: ئەی محەمەد (ﷺ) ئەی ئیماندار بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی. (١)
پادشای خەڵکی (٢)
بە خوای خەڵکی. (٣)
لە شەڕ و خراپەی ئەوەی کە وەسوەسە و خەتەرە و خەیاڵ دەخاتە دڵەوە کە (خەناسە). بریتییە لەوەی کە وەسوەسە فڕێ دەداتە سینە و دڵ و دەروونی خەڵکییەوە. (٤)
لە پەری و خەڵکی، لە جنۆکە و ئادەمیزاد (ئەوانەی کە شەیتان سیفەتن). (٥)
لە پەری و خەڵکی (لە جنۆکە و ئینسان ئەوانەی شەیتان سیفەتن). (٦)

پ٥: سورەتی (العصر) بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟
وەڵام: **وَٱلْعَصْرِ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَفِى خُسْرٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلْحَقِّ وَتَوَاصَوْا۟ بِٱلصَّبْرِ** (العصر ١-٣)
ڕامانەکەی بە کوردی: سوێند بە زەمانە، سوێند بەکاتی عەسر. (١)
بەڕاستی ئادەمیزاد لە زەرەرمەندی و خەسارەتمەندیدایە. (٢)
بێجگە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کار و کردەوەچاکەکانیان ئەنجامداوە و ئامۆژگاری یەکتریشیان کردووە کە هەمیشە پابەندی حەق بن (پابەندی



حەقیش پێویستی بە خۆگری هەیە)، لەبەر ئەوە بەردەوام ئامۆژگاری یەکتریان کردووە تا هەمیشە و بەردەوام، خۆگر و ئارامگریش بن. (٣)

پ٦: سورەتی (الزلزلة) بخوێنەرەوە و ڕاڤە و تەفسیری بکە؟

وەڵام: **إِذَا زُلْزِلَتِ ٱلْأَرْضُ زِلْزَالَهَا وَأَخْرَجَتِ ٱلْأَرْضُ أَثْقَالَهَا وَقَالَ ٱلْإِنسَٰنُ مَا لَهَا يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَىٰ لَهَا يَوْمَئِذٍ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ** (الزلزلة ١-٨)

ڕامانەکەی بە کوردی: **کاتێك زەوی دەهێنرێتە لەرزە و بوومەلەرزە زۆر بەهێزەکەی بۆ پێشهات. (١)**

هەرچی لە زەویدا هەبوو لە مادده سەنگینەکانی ناوی دەری پەڕاندو هێنایە دەرەوە. (٢)

(ئەو کاتە) ئادەمیزادیش دەڵێت: ئەوە چیەتی، بۆ وای لێهات (ئیماندار هەست دەکات کۆتایی دنیایە و بەرپابوونی ڕۆژی قیامەتە، بێ ئیمانیش سەری لێدەشێوێت و نازانێت بەرەو کوێ ڕابکات). (٣)

لەو ڕۆژەدا زەوی هەواڵەکانی خۆی دەگێڕێتەوە... (٤)

بەهۆی ئەوەی کە پەروەردگارت ڕایگەیاندووە (ئەی ئینسان) فەرمانی بۆ دەرکردووە (کاتی کۆتایی هاتنیەتی). (٥)

ئەو ڕۆژە خەڵکی دەستە دەستە بەرەو گۆڕەپانی لێپرسینەوە دەردەچن، بەپەرش و بڵاوی، تا کارو کردەوەکانیان ببیننەوە (دیارە کە نامەی کردەوەکان تۆمار کراوە بەدەنگ و ڕەنگەوە). (٦)

جا ئەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە. (٧)

ئەوەش کە بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك شەڕو خراپەی هەبێت، دەیبینێتەوە. (٨)



## بەشی فەرموودە (الحدیث)

پ١: فەرموودەی (إنما الأعمال بالنيات.........) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی یەکەم:

وەڵام: **عن أمير المؤمنين عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رضي الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (ﷺ)- يَقُولُ: «إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ لِدُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ»، (أخرجه البخاری و مسلم).**

ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی:"لە ئەمیری باوەڕدارانەوە عومەری کوڕی خەتاب (خوا لێی ڕازی بێت)، دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بوو دەیفەرموو:(لەڕاستیدا هەموو کردار و ڕەفتارەکان بەنیازی دڵن , هەرکەسێک بەنیازی دڵی خۆی لای خوا پاداشتی دەست دەکەوێت , هەرکەس کۆچەکەی بۆ شتیکی دنیایی بێت، کە دەستی بکەوێت یا بۆ ئافرەتێک بێت کە مارەی بکات , ئەوە کۆچەکەی بۆ ئەوە بووە کە کۆچی بۆ کردووە، واتە(مەبەستی ڕەزامەندیی خوا نەبووە و لای خوا هیچ پاداشتێکی دەست ناکەوێت.)

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

١. هەموو کار و کردەوەیەك دەبێت نییەتی لەگەڵ بێت، وەك: نوێژ، ڕۆژوو و حەج و کردارە باشەکانی دیکە ...هتد.

٢. دەبێ ئیخڵاسیش لە نییەتدا هەبێت بۆ خوا.



پ٢: فەرموودەی (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه، فهو ردٌّ) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی دووەم:

وەڵام: **عن أم المؤمنين أم عبدالله عائشة رضي الله عنها قالت: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: (من أحدث في أمرنا هذا ما ليس منه، فهو ردٌّ)؛ رواه البخاري ومسلمٌ**

ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی:" دایکی باوەڕداران، عائیشەی دایکی عەبدوڵلا (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (هەرکەسێک هەر شتێک لەم دینەی ئێمە دابهێنێت و فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە ڕەتکراوەیە.)

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

١. نەهی لە بیدعە کراوە لە دیندا.
٢. هەروەها ئەو کارانەش کە لە دیندا داهێنراون، پەسەند نین و ڕەتکراوەن.

پ٣: فەرموودەی جبرائیل بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی سێیەم:

وەڵام: **عَن عُمَر رضي الله عنه، قال: "بَيْنَما نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ رسُولِ الله (ﷺ)إذْ طَلَعَ عَلَيْنَا رَجُلٌ شَدِيدُ بَياضِ الثِّيَابِ شَديدُ سَوَادِ الشَّعَرِ، لا يُرَى عليه أَثَرُ السَّفَرِ ولا يَعْرِفُهُ مِنَّا أَحَدٌ، حَتى جَلَسَ إلى النَّبِّي (ﷺ)، فأَسْنَدَ رُكْبَتَيْهِ إلى رُكْبَتَيْهِ ووَضَعَ كَفَّيْهِ على فَخِذَيْهِ، وقال: يا محمَّدُ أَخْبرني عَن الإسلامِ، فقالَ رسُولُ الله (ﷺ): الإسلامُ أَنْ تَشْهَدَ أَنْ لا إلهَ**

**إلا اللهُ وأنَّ محمَّدًا رسولُ الله، وتُقِيمَ الصَّلاةَ، وتُؤْتيَ الزَّكاةَ، وتَصُومَ رَمَضان، وتَحُجَّ الْبَيْتَ إن اسْتَطَعتَ إليه سَبيلًا. قالَ صَدَقْتَ. فَعَجِبْنا لهُ يَسْأَلُهُ ويُصَدِّقُهُ، قال: فأَخْبرني عن الإيمان، قال: أَن تُؤمِنَ باللهِ، وملائِكَتِهِ وكُتُبِهِ، ورسُلِهِ، واليَوْمِ الآخِرِ، وتُؤْمِنَ بالْقَدَرِ خَيْرِهِ وشَرِّهِ، قال: صدقت، قال: فأَخْبرني عَنِ الإحْسانِ. قال: أنْ تَعْبُدَ الله كأنَّكَ تَرَاهُ فإنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فإنَّهُ يَرَاك، قال: فأَخبرني عَنِ السَّاعةِ، قال: ما المَسْؤولُ عنها بأَعْلَمَ من السَّائِلِ، قال: فأخبرني عَنْ أَمَارَتِها، قال: أن تَلِدَ الأمَةُ رَبَّتَها، وأَنْ تَرَى الحُفاةَ العُراةَ العالَةَ رِعاءَ الشَّاءِ يَتَطاوَلُون في الْبُنْيانِ، ثُمَّ انْطَلَقَ، فَلَبِثْتُ مَلِيًّا، ثُمَّ قال: يا عُمَرُ، أَتَدْرِي مَنِ السَّائِلُ؟ قُلْتُ: اللهُ ورسُولُهُ أَعلَمُ، قال: فإنَّهُ جِبْرِيلُ أَتاكُمْ يُعَلِّمُكُمْ دِينَكُمْ" رواه مسلم.**

راماني فەرموودەكە بە كوردى:" لە (عومەر)ەوە (ڕەزای خوای گەورەی لێ بێت) فەرموویەتی :

لە کاتێکدا کە ئێمە دانیشتبووین لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە ناکاودا پیاوێکی جل و بەرگ زۆر سپی و موو زۆر ڕەش دەرکەوت بۆمان، شوێنەواری سەفەرکردنی پێوە نەدەبینرا، وە کەسیش لە ئێمە نەیدەناسی، تاکوو لە لای پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشت، جا هەردوو ئەژنۆی دایە پاڵا هەردوو ئەژنۆی پێغەمبەرەوە، وە هەردوو لەپی خستە سەر هەردوو ڕانییەوە، ئینجا وتی: ئەی محەمەد هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە ئیسلام .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ئیسلام بریتییە لەوەی کە شایەتی بدەیت بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نییە شایستەی پەرستن بێت جگە لە خوا، وە بەڕاستی محەمەد (ﷺ) پێغەمبەری خوایە و نوێژە فەرزەکان بە ڕێکوپێکی بکەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگریت و حەجی ماڵی خوای گەورە ئەنجام بدەیت ئەگەر توانات هەبوو.




وتی : ڕاستت کرد.

ئێمەش سەرمان سوڕما لەوەی کە پرسیاری لێدەکات و کەچی بەڕاستیشی دەخاتەوە !

وتی: هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە ئیمان .

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: ئیمان بریتییە لەوەی کە باواڕ بێنیت بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی و ڕۆژی دوایی، وە باوەڕ بێنیت بە قەدەر، خێر و شەڕی.

وتی: ڕاستت کرد.

وتی: هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە چاکەکاری.

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: چاکەکاری بریتییە لەوەی کە خوا بپەرستیت وەکوو ئەوەی کە بیبینیت، وە ئەگەر تۆ خوا نەبینیت، ئەوا ئەو تۆ دەبینێت.

وتی: هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی.

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: پرسیارلێکراو زاناتر نییە لە پرسیارکار.

وتی: کەواتە هەواڵم بدەرێ سەبارەت بە نیشانەکانی.

پێغەمبەری خوایش (ﷺ) فەرمووی: کەنیزەك خاوەن و سەروەرەکەی خۆی لێ دەبێت، وە دەبینیت کەسانێکی پێ پەتی (الحفاة) و ڕەش و ڕووت (العراة) و هەژار و نەدار (العالة) و شوانی مەڕ و ماڵات (رعاء الشاء) بینایەی بەرز دروست دەکەن.

ئینجا پیاوەکە ڕۆیشت و منیش ماوەیەك چاوەڕێم کرد .



ئینجا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ئەی عومەر ئایا دەزانیت ئەوەی کە پرسیاری کرد کێ بوو؟

وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی زاناترن.

فەرمووی: ئەوە جوبرەئیل بوو، هاتبوو فێرە دینەکەتان بکات."

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

١. باسی هەر پێنج پایەکانی ئیسلامی کردووە، کە ئەمانەن:

- شایەتمان، کە هیچ خوایەك نییە جگە لە (الله)، محەمەدیش (ﷺ) پێغەمبەری خوایە
- نوێژکردن
- زەکاتدان
- بەڕۆژووبوونی مانگی ڕەمەزان
- حەجکردنی ماڵی خوا

٢. باسی هەر شەش پایەکانی باوەڕی کردووە، کە بریتین لەمانەن:

- باوەڕ بە خوا
- باوەڕ بە فریشتەکانی
- باوەڕ بە کتێبەکانی
- باوەڕ بە پێغەمبەرەکانی
- باوەڕ بە ڕۆژی دوایی
- باوەڕ بە قەدەر (خێرەکەی و شەڕەکەی)

٣. باسی پایەی چاکەکاری (ئیحسان)ی کردووە، چاکەکاری بریتییە لەوەی کە خوا بپەرستیت وەکوو ئەوەی کە ببینیت، وە ئەگەر تۆ خوا نەبینیت، ئەوا ئەو تۆ دەبینێت.



٤. باسی ڕۆژی دوایی (قیامەت)ی کردووە، کە جگە لە خوا کەس نایزانێت کەی قیامەت دێت و بەرپا دەبێت.

پ٤: ئەو فەرموودەیە بخوێنەرەوە، کە باس لە فەزلی ڕەوشتبەرزی(حسن الخلق) دەکات، هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی چوارەم:

وەڵام: **حديث أبي هريرة (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ): (أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم خلقاً) رواه الترمذي و قال: حديث حسن صحيح.**

ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی: ئەبی هورەیرە خوا لێی ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی:"باوەڕدارترینتان ئەوانەتانن کە ڕەوشتیان بەرزە."

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

١. هاندان بۆ ڕەوشتبەرزی.
٢. ڕەوشبەرزی لە ئیمان کاملییەوەیە.
٣. هەرچی باوەڕ (ئیمان)یشە، کەم دەبێت و زیادیش دەبێت.

پ٥: فەرموودەی (من حلف بغير الله..........) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی پێنجەم:

وەڵام: **عن ابن عمر (رضي الله عنه)، أن النبي (ﷺ) قال: (من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك) رواه الترمذى**



ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی:" لە کوڕی عومەرەوە، خوا لێی ڕازی بێت، ڕیوایەت کراوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "هەر کەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوا بێباوەڕ یان موشرك دەبێت."

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- دەبێت تەنیا بە خوا سوێند بخۆن
- سوێندخواردن بەغەیری خوا، هاوبەش دانان (شیرك)ی بچووکە.

پ٦: فەرموودەی (لا يُؤْمِنُ أحدُكم حتى أكونَ أحبَّ إليه ....) بخوێنەرەوە و باسی هەندێك لە سوودەکانیشی بکە؟

فەرموودەی شەشەم:

وەڵام: عن أنس (رضي الله عنه)، قال رسول الله (ﷺ) :"لا يُؤْمِنُ أحدُكم حتى أَكُونَ أَحَبَّ إليه مِن وَلَدِه، ووالِدِه، والناس أجمعين." رواه البخاری و مسلم

ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: (ئیمانی هیچ کەسێکتان تەواو نابێت، تاکوو من لە لای ئەو، لە باوکی و کوڕەکەی و گشت خەڵکی خۆشەویستتر نەبم.)

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

- پێویستە خۆشەویستی پێغەمبەر (ﷺ) لە خۆشەویستی هەموو کەسێك زیاتر بێت.
- خۆشەویستی پێغەمبەر لە باوەڕی تەواوەیە



پ٧: فەرموودەی (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی حەوتەم:

وەڵام: **عن أنس بن مالكٍ (رضي الله عنه) ، قال رسول الله (رضي الله عنه): (لا يؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه ما يحب لنفسه) رواه البخاري ومسلم.**

ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی: **ئەنەس، خوا لێی ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: "کەسێک لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێ، تاکوو بۆ براکەی پێی خۆش نەبێ، ئەوەی کە بۆ نەفسی خۆی پێی خۆشە."**

**هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

- **پێویستە لەسەر ئیماندار، هەر خێرێك پێی خۆشە بۆ خۆی، بۆ ئیماندارانیش پێی خۆش بێت، چونکە ئەوە لە باوەڕی تەواوەیە.**

پ٨: ئەو فەرموودەیە بخوێنەرەوە، کە باس لە فەزلی سورەتی (الاخلاص) دەکات، هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی هەشتەم:

وەڵام: **عَنْ أَبِي سَعِيدٍ(رضي الله عنه) عن رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ) قال: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ) رواه البخارى**

ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی: **ئەبی سەعید خوا لێی ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی:"سوێند بەو خوایەی**



نەفسی منی بەدەستە، فەزل و خێری سورەتی (الاخلاص)هێندەی سێیەکی قورئانی پیرۆزە، واتە سێ جار خوێندنی، وەك خەتمێکی قورئان وایە."

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

١. باسی فەزل و خێری سورەتی ئیخلاس دەکات.
٢. خێری خوێندنەوەکەی، بەقەدەر خێری سێیەکی قورئانە.

پ٩: ئەو فەرموودەیە بخوێنەرەوە، کە باس لە فەزلی (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِالله.....) دەکات، هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی نۆیەم:

وەڵام: **عن أبي موسى (رضي الله عنه)، قال رسول الله (ﷺ) (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ كَنْزٌ مِنْ كُنُوزِ الْجَنَّةِ) رواه البخاري و مسلم**

ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی:" ئەبی مووسا خوا لێی ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی:" وتنی (لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّه)، گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشت."

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

١. فەزلی ئەم وشەیە، وەك گەنجینەیەك وایە، لە گەنجینەکانی بەهەشت.
٢. ئەم وشەیە، وا لە بەندە دەکات، کە پشت بە هێز و قووەتی خۆی نەبەستێت و پشت بە خوای گەورە ببەستێت.

پ١٠: فەرموودەی (أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی دەیەم:

وەڵام: **عن النعمان بن بشير (رضي الله عنه): سمعت رسول الله (ﷺ) يقول: «أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ) رواه البخاري و مسلم**



ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی:" **نوعمانی کوڕی بەشیر خوا لێی ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی:" ئاگاداربن لە لاشەدا پارچە گۆشتێک هەیە ، ئەگەر چاک بوو ، ئەوە هەموو لاشە چاک دەبێ ، ئەگەر خراپیش بوو ، ئەوە هەموو لاشە خراپ دەبێ ، ئاگاداربن ئەویش دڵە."**

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

١. ئەگەر دڵ چاك بوو، ئەندامەکانی دیکەی جەستەش چاك دەبن.
٢. گرنگی بە چاکبوونی دڵ بدرێت، چونکە بە چاکبوونی دڵ، مرۆڤ چاك دەبێت.

پ١١: فەرموودەی (من كان آخر كلامه من الدنيا لا إله إلا الله ..........) بخوێنەرەوە و هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟

فەرموودەی پانزدەهەم:

وەڵام: **عن معاذ بن جبل قال: قال رسول الله (ﷺ) : من كان آخر كلامه لا إله إلا الله دخل الجنة. رواه أبوداود**

ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی:" **مەعازی کوڕی جەبەل خوا لێی ڕازی بێت، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی:" هەر کەسێك کۆتا وشەی (لا إله إلا الله) بێت، دەچێتە بەهەشتەوە."**

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

١. فەزلی (لا إله إلا الله)، کە بەهۆیەوە بەندە دەچێتە بەهەشتەوە.



٢. هەروەها فەزلی ئەو کەسەش کە کۆتا وشەی لە دنیادا (لا إله إلا الله)یە.

**پ١٢: فەرموودی کوڕی مەسعوود لەبارەی (زمانپارێزی) بخوێنەرەوە، هەندێك لە سوودەکانیشی باس بکە؟**

فەرموودەی دوانزدەهەم:

وەڵام: **عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) قال: قال رسول الله (ﷺ) :" ليس المؤمن بالطعان ولا اللعان ولا الفاحش ولا البذيء." رواه الترمذي**

ڕامانی فەرموودەکە بە کوردی:**" باوەڕدار تانە و تەشەرلێدەر و لەعنەت و نەفرینکەر و جوێندەر و دەمپیس نییە."**

هەندێك لە سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:

١. نەهی کردن لە وشەی ناشیرین و کرێت.

٢. ئەوە سیفەتی باوەڕدارە لە زمانەکەیدا.





## بەشی ئادابە ئیسلامیەکان

### ئەدەب لەگەڵ خوا

پ١: ئەدەب لەگەڵ خوا دەبێ چۆن بێت؟

وەڵام:

١. خوا بەگەورە بزانرێت.
٢. تەنیا خوا بپەرسترێت.
٣. فەرمانبەرداری خوا بکرێت.
٤. بێ فەرمانی خوا نەکرێت و تاوان و گوناهی بەرامبەر نەکرێت.
٥. سوپاسگوزاری خوا بکرێت لەسەر ناز و نیعمەتەکانی.

### ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەر (ﷺ)

پ٢: ئەدەب لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەبێ چۆن بێت؟

وەڵام:

١. شوێنکەوتەی پێغەمبەر بێت و بکرێتە پێشەنگ و ئیقتیدای پێ بکرێت.
٢. گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکرێت.
٣. بێ فەرمانی پێغەمبەر نەکرێت و تاوان و گوناهی بەرامبەر نەکرێت.
٤. ئەوەی کە بۆ پێغەمبەر ڕەوانەکراوە باوەڕی پێ بهێنرێت.
٥. شتی نوێ لە سوننەتی پێغەمبەردا زیاد نەکرێت.

٦. پێغەمبەری لە خۆی و خەڵکی خۆشتر بوێت.
٧. پێغەمبەر بەگەورە بزانرێت و هەوڵی سەرخستنی خۆی و سوننەتەکەی بدرێت.

## ئەدەب لەگەڵ دایك و باوك

پ٣: ئەدەب لەگەڵ دایك و باوك دەبێ چۆن بێت؟
وەڵام:
١. گوێڕایەڵی دایك و باوکم دەبم، بەمەرجێك بێ فەرمانی خوای تێدا نەبێت.
٢. خزمەتی دایك و باوکم دەکەم.
٣. هاریکاریی دایك و باوکم دەکەم.
٤. نیاز و پێداویستییەکانی دایك و باوکم جێبەجێ دەکەم.
٥. دوعا بۆ دایك و باوکم دەکەم.
٦. بەئەدەبەوە قسە لەگەڵ دایك و باوکم دەکەم، تەنانەت پێیان ناڵێم: "ئۆف"، کە کەمترین بێژەیە.
٧. ڕووخۆش دەبم بەرامبەر بە دایك و باوکم و ڕووگرژ نابم.
٨. دەنگی خۆم بەسەر دەنگی دایك و باوکمدا بەرز ناکەمەوە، هەروەها گوێیان لێدەگرم و قسەیان پێنابڕم و بەناوی خۆیان گازیان ناکەم، بەڵکوو پێیان دەڵێم:"بابەگیان" و "دایەگیان".
٩. ئەگەر دایك و باوکم لە ژووری تایبەتی خۆیان بوون، بەبێ مۆڵەت وەرگرتن ناچمە ژوورەکەیان.
١٠. دەست و سەری دایك و باوکم ماچ دەکەم.



## ئادابەکانی پەیوەندیی خزمایەتی (سیلەی ڕەحم)

پ٤: چۆن سیلەی ڕەحم جێبەجێ بکەم؟

وەڵام:

١. سەردانی خزم و کەس و نزیکەکان بکرێت، لە برا و خوشك و مام و مەت (پوور) و خاڵ و خاڵەت (پلك) و هیتر.

٢. چاکەکردن لەگەڵیاندا بە گوتن و کردار، هەروەها هاریکاریکردنیشیان.

## ئادابەکانی برایەتی ئیمانی و ئیسلامی

پ٥: چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ برا و هاوڕێکانم بکەم؟

وەڵام:

١. هاوڕێیەتی کەسانی چاکەکار دەکەم و خۆشمدەوێن.

٢. لە هاوڕێیەتیکردنی خراپەکاران دوور دەکەومەوە.

٣. سەلام لە برا و هاوڕێکانم دەکەم.

٤. ئەگەر نەخۆش کەوتن، سەردانیان دەکەم و دوعای شیفایان بۆ دەکەم.

٥. ئەگەر کەسێك لە کاتی پژمین وتی :(الحمدلله)، پێی دەڵێم:(يَرْحَمُكَ اللهُ).

٦. ئەگەر منی دەعوەت کردن، بەپیر دەعوەتەکەیەوە دەچم.

٧. ئامۆژگاریی دەکەم.

٨. ئەگەر ستەمی لێکرا، سەری دەخەم، ئەگەر ستەمیشی کرد، ڕێگری لێ دەکەم.



٩. ئەوەی کە بۆ خۆم خۆش دەوێ، بۆ برای موسڵمانیشم خۆش دەوێ.
١٠. ئەگەر پێویستی بە هاریکاریی بوو، بەهانایەوە دەچم.
١١. نە بە گوتن، نە بە کردار، ئازاری نادەم.
١٢.پەنهانی و نهێنییەکانی دەپارێزم.
١٣. قسەی پێ ناڵم و ئیهانەی ناکەم، هەروەها غەیبەتیشی ناکەم و بەچاوێکی کەم سەیری ناکەم، دیسان ئیرەیی پێ نابەم و سیخوڕی بەسەریەوە ناکەم و فێلی لێ ناکەم.

## ئادابەکانی هاوسێیەتی (جیرانی)

پ٦: ئادابەکانی هاوسێیەتی (جیرانی) چین؟

وەڵام:
١. بە گوتن و کردار چاکە لەگەڵ هاوسێدا دەکەم، ئەگەر پێویستیشی بە من بوو، ئەوا یارمەتیی دەدەم.
٢. لە جەژن و بۆنەکاندا پیرۆزبایی لێ دەکەم.
٣. ئەگەر نەخۆش کەوت، سەردانی دەکەم، ئەگەر بەهی و تازیەشی هەبوو، سەرەخۆشیی لێ دەکەم.
٤. ئەوەی لە توانامدا بێت لە خواردن و خواردنەوە پێشکەشی دەکەم.
٥. نە بەگوتن، نە بەکردار، ئازاری هاوسێم نادەم.
٦. بەدەنگی بەرز، بێزار و هەراسانی ناکەم، هەروەها کاری سیخوڕیشی بەسەریەوە ناکەم و لەگەڵی بەسەبر و ئارام دەبم.



## ئادابەکانی میوانداری

پ٧: ئادابەکانی میوانداری و میوان چین؟
وەڵام:
١. ئەگەر منیان بۆ میوانداری دەعوەت کرد، دەعوەتەکە قبووڵ دەکەم.
٢. ئەگەر بمەوێ سەردانی کەسێك بکەم، سەرەتا مۆڵەت وەردەگرم و وادە(مەوعد)ێك دادەنێم.
٣. پێش ئەوەی بچمەماڵیان، مۆڵەت وەردەگرم.
٤. ماوەیەکی زۆر لە ماڵەکەیان نامێنمەوە.
٥. چاوم لەئاست خەڵکی ئەو ماڵە دادەخەم و تەماشای عەرز و nامووسیان ناکەم.
٦. بەڕوویەکی خۆش و بەگەرمترین شێوە و بەجوانترین وشە، پێشوازی لە میوانەکانم دەکەم.
٧. میوانەکانم لە باشترین شوێن دادەنێم.
٨. بە خواردن و خواردنەوە، ڕێز لە میوانەکانم دەگرم.

## ئادابەکانی نەخۆشی

پ٨: باسی ئادابەکانی نەخۆشی و سەردانی نەخۆش بکە؟
وەڵام:
١. ئەگەر هەستم بە ئازار کرد، دەستی ڕاستم لەسەر ئەو شوێنە دادەنێم و سێ جار دەڵێم:(بسم الله)، هەروەها حەوت جار دەڵێم:(أعوذُ بعزَّةِ اللهِ وقدْرَتِهِ مِنْ شرِّ ما أجدُ و أحاذر).



٢. ڕازی دەبم بە قەدەری خوا و سەبر و ئارام دەگرم.
٣. پەلە دەکەم بۆ سەردانکردنی برا نەخۆشەکەم، هەروەها دوعاشی بۆ دەکەم و ماوەیەکی زۆر لای نامێنمەوە.
٤. ڕوقیە (دوعا)ی بەسەردا دەخوێنمەوە، بەبێ ئەوەی داوام لێ بکات.
٥. ئامۆژگاریی دەکەم کە دوعا بۆ خۆی بکات و سەبر و ئارام بگرێت، هەروەها دەستنوێژ هەڵبگرێت و نوێژ بکات.

## ئادابەکانی زانستخوازی

پ٩: باسی ئادابەکانی زانستخوازی بکە؟
وەڵام:
١. نیازم پاك بێت لەپێناوی خوا.
٢. کار بەو زانستە بکەم، کە بەدەستم هێناوە.
٣. ڕێز لە مامۆستام دەگرم، چ لە حزوری ئەودا بم یان نا.
٤. بە ئەدەبەوە لە بەرامبەری دادەنیشم.
٥. بە جوانی گوێ بۆ قسەکانی دەگرم و لە کاتی وانەوتنەوە قسەکانی نابڕم.
٦. بەخستنەڕووی پرسیار، فێرە ئەدەب دەبم.
٧. بەناوی خۆی بانگی ناکەم.

## ئادابەکانی کۆڕ و مەجلیسەکان

پ١٠ ئادابەکانی کۆڕ و مەجلیسەکان چین؟
وەڵام:
١. سەلام لە ئەهلی کوڕ و مەجلیس دەکەم.
٢. لە کوێ جێ هەبوو، لەو شوێنە دادەنیشم، نە کەس لە شوێنی خۆی هەڵدەستێنم، نە دەچمە نێوان دوو کەسیش، مەگەر مۆڵەتم پێ بدەن.



٣. جێ بۆ کەسانی دیکە دەکەمەوە، تا ئەوانیش دابنیشن.
٤. قسەی کەس لە ناو کۆڕ و مەجلیسدا نابڕم.
٥. پێش جێهێشتنی کوڕ و مەجلیسەکە، مۆڵەت وەردەگرم و سەلامی خواحافیزی دەکەم.
٦. کە کۆڕ و مەجلیسەکە تەواوبوو، دوعای کەفارەتی کۆڕ و مەجلیسەکە دەخوێنمەوە، کە ئەمەیە: "سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ."

## ئادابەکانی نووستن

پ١١: باسی ئادابەکانی نووستن بکە؟

وەڵام:

١. زوو دەخەوم.

٢. بەدەستنوێژەوە دەخەوم.

٣. لە کاتی نووستن، لەسەر سکم ڕاناکشێم.

٤. لەسەر تەنیشتی ڕاست دەخەوم، دەستی ڕاستیشم دەخەمە ژێر شەویلاکی ڕاستم.

٥. پێش نووستن، جێگایەکەم ڕادەتەکێنم.

٦. زیکر و ویردەکانی نووستن دەخوێنمەوە، وەك: ئایەتی کورسی، هەروەها سێ جار سورەتی (الاخلاص) و سورەتی (الفلق) و سورەتی(الناس) دەخوێنمەوە و دەڵێم: (باسمك اللهم أموت و أحيا.)

٧. بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستم.

## ئادابەکانی نانخواردن

پ١٢: ئادابەکانی نانخواردن چین؟

وەڵام:

١. نییەتم وایە ئەو خواردن و خواردنەوەیە، بەهێزم بکات لەسەر گوێڕایەڵی و ملکەچی خوای گەورە.

٢. پێش نانخواردن، هەردوو دەستەکانم دەشۆم.

٣. دەڵێم: (بسم الله)، ئینجا بەدەستی ڕاست دەخۆم، لەلای خۆمەوە دەیخۆم و له ناوەندی سینییەکە ناخۆم، یان لەپێش کەسێکی دیکە ناخۆم.

٤. ئەگەر لەبیرم کرد (بسم الله) بکەم، ئەوا هەرکاتێ بیرم هاتەوە دەڵێم:"بسم الله أوله و اخيره."

٥. هەرچی هاتە پێشم لە خواردن و خواردنەوە، ڕازیی دەبم پێی، هەروەها خواردنەکەش عەیبدار ناکەم، ئەگەر حەزم لێی بوو دەیخۆم، ئەگەر حەزیشم لێی نەبوو، نایخۆم.

٦. چەند پارووەك دەخۆم و زیاد لە ئەندازە ناخۆم.

٧. پف لە خواردن و خواردنەوە ناکەم، بەڵکوو جێ دێڵم تا سارد دەبێتەوە.

٨. لەگەڵ خێزانەکەم و میوانەکان خواردن دەخۆم.

٩. پێش ئەو کەسانە دەست بە خواردن ناکەم، کە لە خۆم گەورەترن.

١٠. کاتی ئاو خواردنەوە (بسم الله) دەکەم، ئینجا بەدانیشتنەوە ئاو دەخۆمەوە و بە سێ قوم ئاو دەخۆمەوە.

١١. کە لە خواردن و خواردنەوە بوومەوە، سوپاسگوزاری خوا دەکەم.

## ئادابەکانی جلپۆشین

پ١٣: ئادابەکانی جلپۆشین بژمێرە؟

وەڵام:

١. جلەکانم لەلای ڕاستەوە دەپۆشم، هەروەها سوپاسی خوا دەکەم کە جلی پێ بەخشیم.

٢. جلەکانم تا ژێر گۆزینگ (قولەپێ)یەکانم درێژ ناکەمەوە.

٣. کوڕەکان جلی کچەکان ناپۆشن، کچەکانیش جلی کوڕەکان ناپۆشن.

٤. جلەکان نابێت وەك جلی بێباوەڕ و فاسقەکان بێت.

## ئادابەکانی سواربوون

پ١٤: باسی ئادابەکانی سواربوون بکە؟

وەڵام:

١.دەڵێم:"بسم الله، الحمدلله"، خوای گەورە لەمبارەیەوە دەفەرموێت:

**سُبْحَٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ** (الزخرف ١٣-١٤)

ڕامانەکەی بە کوردی: ستایش و بەرزی و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە ئەمەی بۆ ڕەخساندووین (خۆ ئەگەر ئەو بە میهرەبانی خۆی بۆی ڕام نەکردینایە)، ئەوا ئێمە نەماندەتوانی ڕامیان بهێنین.



ئێمە بێگومان هەر بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. پێغەمبەر (ﷺ) هەر جارێك سواری وڵاخەکەی ببوایە سێ جار (الله أكبر)ی دەفەرموو، دوایی دەیفەرموو: سُبۡحَـٰنَ ٱلَّذِی سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقۡرِنِینَ وَإِنَّاۤ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ.

٢. ئەگەر بەلای موسڵمانێکدا تێپەڕیم، سەلامی لێ دەکەم.

## ئادابەکانی ڕێگا

پ١٥: باسی ئادابەکانی ڕێگا بکە؟

وەڵام:

١. لە ڕۆیشتندا مامناوەند دەبم، واتە نەزۆر خێرا دەڕۆم، نەزۆریش هێواش دەڕۆم، بەڵکوو بەشێوەیەکی مامناوەند ڕێ دەکەم، هەروەها بەلای ڕاستی ڕێگاشدا دەڕۆم.

٢. کێم دیت، سەلامی لێ دەکەم.

٣. چاوەکانم لەئاست خەڵکی دادەخەم و ئازار بەکەس ناگەیەنم.

٤. فەرمان بەچاکە و نەهی لەخراپە دەکەم.

٥. ئەگەر شتێك کەوتبێتە سەر ڕێگا، لای دەبەم.

## ئادابەکانی چوونە ماڵەوە و دەرچوون لە ماڵەوە

پ١٦: باسی ئادابەکانی چوونە ماڵەوە و دەرچوون لە ماڵەوە بکە؟

وەڵام:

١. کە لە ماڵەوە دەرچووم، سەرەتا پێی چەپم دەخەمەوە دەرەوە و دەڵێم:"بِسْمِ اللَّهِ توكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ، وَلا حوْلَ وَلا قُوةَ إلاَّ بِاللَّهِ، اللهم إني



أعوذ بك أن أضل أو أُضَلّ، أو أزل أو أُزَلّ، أو أظلم أو أُظْلَم، أو أجهل أو يُجْهَل عليَّ."

٢. كە هاتمە ماڵەوە، پێی ڕاستم دەخەمەوە ژوورەوە و دەڵێم: "بسم الله ولجنا، وبسم الله خرجنا، وعلى ربنا توكلنا."

٣. سەلام لە خێزان و ماڵباتەکەم دەکەم و دەست دەکەم بە سیواککردن.

## ئادابەکانی چوونە ئاودەست

پ١٧: باسی ئادابەکانی چوونە ئاودەست بکە؟

وەڵام:

١. سەرەتا، پێی چەپم دەخەمە ژوورەوە.

٢. پێش چوونە ژوورەوە، دەڵێم:"بسم الله، اللهم إني أعوذ بك من الخبث و الخبائث."

٣. هەر شتێك زیکری خوای تێدابێت، لەگەڵ خۆم نایبەمە ژوورەوە.

٤. کە تەواوبووم و خۆم پاککردەوە، خۆم دادەپۆشم.

٥. لەناو ئاودەست قسە ناکەم.

٦. لە ئاودەست ڕوو لە قیبلە ناکەم، لە کاتی پیسایی یان میزکردن ڕوو یان پشت لە قیبلە ناکەم.

٧. بەدەستی چەپم خۆم دەشۆم و دەستی ڕاستەم بەکارناهێنم.

٨. لەسەر ڕێی خەڵك یان لەژێر سێبەریان مێز و پیسایی ناکەم.

٩. کە لە ئاودەست تەواوبووم، سەرەتا پێی ڕاستم دەخەمە دەرەوە و دەڵێم:"غفرانك."

١٠. کە لە ئاودەست هاتمە دەرەوە، دەستەکانم دەشۆم.

## ئادابەکانی مزگەوت

پ١٨: باسی ئادابەکانی مزگەوت بکە؟

وەڵام:

١. سەرەتا، پێی ڕاستم دەخەمە ناو مزگەوتەوە و دەڵێم:"بسم الله، اللهم افتح لی أبواب رحمتك."

٢. تا دوو ڕکعەت نوێژ نەکەم دانانیشم.

٣. لە پێش نوێژخوێنان تێناپەڕم، هەروەها گاز ناکەم بۆ دۆزینەوەی شتە ونبووەکان، هەروەها کڕین و فرۆشتنیش لەناو مزگەوتدا ئەنجام نادەم.

٤. لە کاتی چوونە دەرەوە لە مزگەوت، پێی چەپم دەخەمە دەرەوە و دەڵێم:"اللهم إني أسألك من فضلك."

## ئادابەکانی سەلامکردن

پ١٩: باسی ئادابەکانی سەلامکردن بکە؟

وەڵام:

١. ئەگەر لە ڕێگا موسڵمانێکم دیت، سەلامی لێ دەکەم و دەڵێم:" السلام علیکم و رحمة الله و برکاته."، بەسەلام نەبێ، بەهیچ شتێکی دیکە سەلام ناکەم،هەروەها بەتەنیا دەست بەرز ناکەمەوە.

٢. بەڕوویەکی خۆش و گەش سەلام دەکەم.

٣. بەدەستی ڕاست تەوقە دەکەم.



٤. ئەگەر کەسێك سەلامی لێکردم، من بەشێوەیەکی باشتر وەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە.

٥. ئەگەر بێباوەڕ سەلامی لێکردم، وەك خۆی وەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە.

٦. گچکە سەلام لە گەورە دەکات، سواریش سەلام لە پیادە دەکات، ئەوەی لە ڕێ دەڕوات، سەلام لەو کەسە دەکات کە دانیشتووە، کەمیش سەلام لە زۆر دەکات.

## ئادابەکانی مۆڵەتوەرگرتن

پ٢٠: باسی ئادابەکانی مۆڵەتوەرگرتن بکە؟

وەڵام:

١. پێش ئەوەی بچمە شوێنێك، مۆڵەت وەردەگرم.

٢. سێ جار داوای مۆڵەت دەکەم، نەك زیاتر، ئەگەر مۆڵەتیان پێ نەدام، دەگەڕێمەوە.

٣. بە هێواشی لە دەرگا دەدەم، لە بەرامبەر دەرگاش ناوەستم، بەڵکوو لەلای ڕاستی دەرگا، یان لەلای چەپی دەرگا دەوەستم.

٤. بەبێ مۆڵەتوەرگرتن ناچمە ژووری دایك و باوکم، یان هەر کەسێکی دیکە، بەتایبەتی پێش نوێژی بەیانی و دوای نیوەڕۆ و پاش نوێژی شەوان (العشاء).

٥. دەتوانم بەبێ مۆڵەتوەرگرتن سەردانی نەخۆشخانە و سۆپەرمارکێت و دووکانەکان بکەم.



## ئادابەکانی سەرەدەرکردن لەگەڵ ئاژەڵ

پ٢١: باسی ئادابەکانی سەرەدەرکردن لەگەڵ ئاژەڵ بکە؟
وەڵام:
١. ئاو و ئاڵیك بە ئاژەڵ دەدەم.
٢. بەنەرمونیانی سەرەدەر لەگەڵ ئاژەڵ دەکەم و زیاد لە حەددی خۆی باری لێ ناکەم.
٣. بەهیچ جۆرێك ئەزیەت و ئازاری ئاژەڵ نادەم.

## ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز

پ٢٢: باسی ئادابەکانی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بکە؟
وەڵام:
١. خۆم پاك دەکەمەوە و دەستنوێژ هەڵدەگرم، ئینجا قورئان دەخوێنمەوە، واتە بەبێ غوسڵ و دەستنوێژ، قورئانی پیرۆز ناخوێنمەوە.
٢. لە کاتی قورئان خوێندنەوە، بە ئەدەب و ویقار دادەنیشم.
٣. پێش دەستپێکردنی قورئان، دەڵێم:(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم).
٤. لە کاتی قورئان خوێندنەوە، بەحزوری دڵ، بیر لە ڕامان و واتاکانی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز دەکەمەوە و تەدەبوری تێدا دەکەم.

وَصَلَّى اللَّهُ وسلّم عَلَى سَيِّدِنَا مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ .

ئـەم کتێبەی کـە ئێستا لەبەردەستی ئێوەی هێژادایە، بـەنـاوی: "چۆن منداڵەکانمان فێری ئیمان و ئیسلام بکەین؟"، وەك کەتەلۆکێك وایە بـۆ منداڵە موسڵمانەکان، واتە منداڵەکانی ئێمە لە ڕێگەی ئـەم کتێبەوە بە خـــوا و پێغەمبەران(علیهم السلام) و کتێبە ئاسمانییەکان و پایەکانی ئـیـمـان و ئیسلام ئاشنا دەبـن و لێی سـوودمەند و بەرهرەمەند دەبن. بـۆیـە هیوادارم ئـەم دیارییە بـەنرخە بگاتە دەست هەموو منداڵانی کـوردسـتـان ، بـۆ ئەوەی زیاتر خوا و ئیمان و ئیسلامیان خۆش بوێت و لەسەر ئەو بناغەیە بێنە پەروەردە و فێرکردن و تێگەیاندن و پێگەیاندن.

**وەرگێڕ**

